سەنتەری زەھاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری

نووسینی:
د. ئیبراهیم کالین
وەرگێڕانی:
محەمەد محەمەد حەمەمیرزا



پەیمانگای جیهانیی
فیکری ئیسلامیی
٢١

# عەقڵ و عەقڵگەرایی
## لە قورئانی پیرۆزدا



ئەم توێژینەوەیە لەسەر مشتومڕ و تاوتوێکردنی بەڵگەیەکی سادە و ئاسان بەرپا بووە، پوختەکەی ئەوەیە دوور لەوە کە عەقڵ خۆی بە خۆی قەوارەیەکی تایبەتە، ئەوا لە دووتوێی میانەیەکی گەورەتردا لەبوون و لەعەقڵگیری و بیرکردنەوەیەکی ڕەوشتیدا ڕۆڵی گەورەی خۆی دەگێڕێ. جا هەروەك شتەکان دەخاتەڕوو، ئەوا لە هەمان کاتیشدا گوزارش لە واقیعی شتەکان دەکات.

عەقڵگەراییش لە دووتوێی میانەیەك لە مانا و لە ناوەڕۆکدا پەیدا دەبێت کە باز دەدات بەسەر پرۆسە ناوەکییەکانی زەینی تاکی مرۆییدا، ڕاستییەکیش خۆی دەسەپێنێ لە مامەڵە و هەڵسوکەوتدا، ئەویش ئەوەیە کە عەقڵ خۆی بە تەنها نابێتە بنەما و بناغە بۆ زانست، یان ڕاستیی، یان عەقڵگەرایی، چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی مەعریفیمان بۆ جیهان لە نێو میانەیەکی فراوانتری پەیوەندییەکان و ماناکانی بووندا ڕوودەدات.

د. ئیبراهیم کالین

العقل والعقلانية
في القرآن الكريم

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
(٢١)

# عەقڵ و عەقڵگەرایی لە قورئانی پیرۆزدا

نووسینی:
د. ئیبراهیم کالین
وەرگێڕانی:
موحەممەد موحەممەد حەمەمیرزا

چاپی یەکەم
١٤٣٤ ك                ٢٠١٣ ز

ناوی کتێب: عەقڵ و عەقڵگەرایی لە قورئانی پیرۆزدا.

نووسینی: د. ئیبراهیم کالین.

وەرگێڕانی: موحەممەد موحەممەد حەمەمیرزا.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (٢١).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (٢٨٦٣)ی ساڵی (٢٠١٢)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٣.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## وتەی وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ پەروەگاری مەزن، درووود لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری سەروەرمان (دروودی خوای لێبێت)، هەروەها لەسەر خانەوادە و یارانی و هەموو شوێنکەوتوانی هەتا رۆژی دوایی.. ئامین.

عەقڵ ئەو بەخششە گەورەی پەروەردگارە کە بەتایبەتی بە مرۆڤی بەخشیوە، کردوویەتی بە نیشانەی جیاکەرەوە لە نێوان مرۆڤ و تەواوی دروستکراوەکانی تری لەم بوونەوەرەیدا، هەر لێرەوە پەیامی ئاسمانیشی بۆ مرۆڤ ناردووە تا وەحی ئاسمان و عەقڵی خۆی ئاوێتە بەیەك بکات و ببێتە مرۆڤێکی هاوسەنگ و چاکەکار، کەواتە (عەقڵ و وەحی) دوو توخمی پێکهێنەری کەسایەتی هەر مرۆڤێکن کە باوەڕدار و چاکەکار بێت. هەرکات یەکێکیانی لەدەستدا، وەك باڵندەیەکی بێباڵ، یان یەك باڵی لێدێ کە توانای فڕینی نابێت، خوای گەورەش مرۆڤی بۆ ئەوە دروستکردووە تا سوودمەند و سوودگەیەنەر و ئاوەدانکەرەوە بێت. هەر لە دێرین زەمانەوە و لەبەر بەهای بەرزی عەقڵ و رۆڵی ئەو عەقڵە و ماهییەتی، بووەتە جێگای توێژینەوە و مشتومڕی زانا و فەیلەسوف و عاریفەکان.

ئەم توێژینەوەیەش کە لەبەردەستدایە، لە نووسینی زانایەکی پسپۆڕ و بەتوانایە لەم بوارەدا، پێش ئەوە بە ئێمەی بڵێ، لە کۆڕبەندێکی سەنگیندا رووی دەمی روو بە کۆمەڵێ زانایە لە هەردوو ئاییین ئیسلام و ئاییینی مەسیحی.

گرنگیی بابەتەکە بۆ خوێنەر و بۆ نێوەندەکانی هزر و رۆشنبیریی کوردی وای لە بەڕێزان مامۆستایانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری کرد بەهەند بیگرن و کەوتنە خەمی وەرگێڕانی بۆ زمانی شیرینی کوردی، بەندەش لەسەر داوای ئەو مامۆستا بەڕێزانە، هەستام بە وەرگێڕانی، ئومێدەوارم لە گەنجینەی فیکری و

ڕۆشنبیریماندا جێگای خۆی بکاتـەوە و ببێتـە وەڵام بـۆ کۆمـەڵێ پرسـیار کـە خولیـای سەرمانە. هەر هەڵە و کەموکوڕییەکیش بەدی دەکرێ، دەگەڕێتەوە بـۆ مـنی وەرگێـڕ و چاوپۆشی دەخوازم.

**وەرگێڕ:**

**موحەممەد موحەممەد حەمەمیرزا**

**٢٠١٢/١٢/٤**

**سلێمانی**

# پێشەکی

دامەزراوەی خانەوادەی شاهانە بۆ هزری ئیسلامی، لەسەر پێگەی (عیماد) بۆ گەورەمان مەسیح (سەلامی خوای لەسەر بێت) میواندارییی دووەمین کۆڕبەندی ئیسلامی– کاسۆلیکی کرد، ئەویش لە شاری (مغطس) لە نێوان ٢١ – ٢٣ی تشرینی دووەمی ساڵی/ ٢٠١١.

ئەو کۆڕبەندەش یەکێکە لە بەرهەمەکانی گوتەی چوون یەك و هاوبەش کە لە ساڵی/ ٢٠٠٧ وەك هەوڵێك بۆ بەهێزکردنی وتووێژی موسڵمان – مەسیحی دەستی بە کارەکانی کرد، کە هەردوو ئایینی ئیسلام و مەسیحیەت ڕێنمایی دەدەن بە (خۆشویستنی خوای گەورە) و خۆشویستنی دراوسێ.

ئەم کۆڕبەندەش لەسەر بناغەی سەرکەوتنی کۆڕبەندی یەکەم بەرپا بووە کە ساڵی/ ٢٠٠٨ لە ڤاتیکان گرێدراوە. لەم کۆڕبەندەشدا (٢٤) بیرمەند لە گەورە زانایانی ئیسلام و مەسیحیەت بەشداری تێدا دەکەن و لەسەر ئەم بابەتانە مشتومڕ دەکەن: عەقڵ و باوەڕ و مرۆڤ.

لە یەکەم ڕۆژی کۆڕبەندەکەدا پرۆفیسۆر ئیبراهیم کالین توێژینەوەیەکی بە ناونیشانی (عەقڵ و عەقڵگەرایی لە قورئانی پیرۆزدا) پێشکەش کرد. هەر لە هەمان ڕۆژدا پرۆفیسۆر ڤیتۆریۆ بۆسنیتی توێژینەوەیەکی بە ناونیشانی (مرۆڤ لە ڕوانگەی عەقڵەوە: تێڕوانینێکی مەسیحیانە) پێشکەش کرد.

لە ڕۆژی دووەمدا فرانسۆ باسکێت توێژینەوەیەکی بە ناونیشانی (مرۆڤ لە ڕوانگەی باوەڕەوە: تێڕوانینێکی مەسیحیانە) بە زمانی فەرەنسی پێشکەش کرد. هەر لەم ڕۆژدا مامۆستای خۆشەویست عەلی جەفری توێژینەوەیەکی بە زمانی عەرەبی بە ناونیشانی (چەمکی باوەڕ لە ئیسلامدا) پێشکەش کرد. لەڕۆژی سێیەمدا پرۆفیسۆر تیمۆسی وینتر توێژینەوەیەکی بە ناونیشانی (مرۆڤ لە ئیسلامدا) پێشکەش کرد. پاشتریش پرۆفیسۆر

ستیڤان هامر توێژینەوەیەکی بە ناوی (مرۆڤ: ڕێز و ماف: تێڕوانینێکی کاسۆلیکیانە)ی پێشکەش کرد.

لە هەر سێ ڕۆژی کۆڕبەندەکەدا بەشداربووان بابەتی توێژینەوە پێشکەشکراوەکانیان بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە و لە دووتوێی کەشوهەوای خۆشەویستیدا خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە بەو مەبەستە تا هەریەکەیان تێبگات لە بۆچوونی لایەنی بەرامبەری.

شایانی باسە کە لە ڕۆژی دووەمدا پادشای ئوردون عەبدوڵڵای دووەمی کوڕی حوسەین سەردانی بەشداربووانی کرد، ئەوانیش لە هەندێ بابەتدا کە جێگای بایەخپێدانی موسڵمان و مەسیحییەکانە بەشدارییان پێکرد.

لە کۆتاڕۆژدا دانیشتنێکی گشتی و بەرفراوان گرێدرا کە سێ کەسی زانا لە هەریەک لە هەردوو لایەنەکە سەرۆکایەتییان دەکرد. لەو دانیشتنەدا وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دایەوە کە ژمارەیەك لە بەشداربووان ئاڕاستەیان کردن. هەر لە سەروبەندی دانیشتنەکەدا بەشداربووان ڕاگەیاندراوێکی کۆتاییان دەرکرد. بڕوانە:

http://acommonworld.com\docs\finaldeclaratio nar.pdf

ئەم نامیلکەیەش وێنەیەکی پاکنووسکراوە لەو توێژینەوەیەی کە دکتۆر ئیبراهیم کالین پێشکەشی کرد و بە هەردوو زمانی فەرەنسی و عەرەبی خرایە ڕوو.

# عەقڵ و عەقڵگەرایی لە قورئانی پیرۆزدا

د. ئیبراهیم کالین

(أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ) (الحج: ٤٦).

ئەم توێژینەوەیە لەسەر مشتومڕ و تاوتوێکردنی بەڵگەیەکی سادە و ئاسان بەرپا بووە، پوختەکەی ئەوەیە دوور لەوە کە عەقڵ خۆی بە خۆی قەوارەیەکی تایبەتە، ئەوا لە دووتوێی میانەیەکی گەورەتردا لە بوون و لە عەقڵگیری و بیرکردنەوەیەکی ڕەوشتیدا ڕۆڵی گەورەی خۆی دەگێڕێ. جا هەروەك شتەکان دەخاتەڕوو، ئەوا لە هەمان کاتیشدا گوزارش لە واقیعی شتەکان دەکات. عەقڵگەراییش لە دووتوێی میانەیەك لە مانا و لە ناوەڕۆکدا پەیدا دەبێت کە باز دەدات بەسەر پرۆسە ناوەکییەکانی زەینی تاکی مرۆییدا، ڕاستییەکیش خۆی دەسەپێنێ لە مامەڵە و هەڵسوکەوتدا، ئەویش ئەوەیە کە عەقڵ خۆی بە تەنها نابێتە بنەما و بناغە بۆ زانست، یان ڕاستیی، یان عەقڵگەرایی، چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی مەعریفیمان بۆ جیهان لە نێو میانەیەکی فراوانتری پەیوەندییەکان و ماناکانی بووندا ڕوودەدات.

وێڕای ئەمەش، ئەوا ئەو مانایانەی کە پەیوەندن بە چەمك و زمانەوە بۆ وشەی عەقڵ – کە لیستێکی درێژ لە دەستەواژەی مەعریفی پەیوەست بەیەکەوە پێکدەهێنن –، مەنزومەیەکی بیرکردنەوەی فراوانتر پێشکەش دەکەن کە دەکرێ عەقڵگەرایی ژمێریایی و گوتاربێژی، ڕاڤە و شیکردنەوەی لەسەر بکەن.

قورئانی پیرۆزیش لە دووتوێی ئەم ڕەوشتی بیرکردنەوە هەرەفراوانەدا مامەڵە لەگەڵ عەقڵ و عەقڵگەراییدا دەکات.

جا هەرجۆرە چەمكێكی عەقڵگەرایی – كە بكرێ بە شێوەیەكی ڕاست و دروست بە (ئیسلامی) وەسف بكرێ– ئەوا لەو میانەیەدا كاردەكات كە من ناوی دەبەم بە میتافیزیكیای دروستكراو، كە ئیقرار دەكات ئەم جیهانە ئیرادەی خوایەكی دانا دروستی كردووە، بە پێشەكییەكیش دەست پێدەكات، پوختەكەی ئەوەیە كە ئەم جیهانە سەرەتا و كۆتاییەكی هەیە: (وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) (القصص: ٨٨)، ئەو سەرەتا و كۆتاییەش بوار و ئاسۆیەك بۆ تاوتوێ و مامەڵەكردنی عەقڵگەرایی و هەڵبژاردە ڕەوشتییەكانمان دەكێشێ.

مرۆڤیش چوون بوونەوەر وایە كە بۆ مەبەستێك دروستكراون و لە تواناشدا نییە لە دووتوێی سنووری بوونێكی خودی عەقڵی مرۆییدا دەستەبەر ببن، بەگەڕخستنی عەقڵیش لە بەرانبەر باكگراوندی بوونی ئەو عەقڵگەراییەوە دێتەدی كە لە لایەكەوە مرۆڤ دەبەستێت بە مرۆڤەكانی ترەوە، هەروەها بە خوای گەورە و بە بوونەوەرەوە لە لایەكی ترەوە.

لە ڕاستیدا ئەو جیهانە دروستكراوەی كە دەستكردی خوایەكی بێهاوتا و بێوێنەیە، توانای بێسنوور و ناوازەی خوای گەورە دەخاتەڕوو، جا لەو پێگەیەوە كە خوای گەورە لەسەر جوانترین و بەهێزترین شێوە شتەكان بەدی دەهێنێت و بە بەردەوامی مەبەستێكیش لەو دروستكردنەدا هەیە، ئەوا ئەو بوونەوەرە سیستم و عەقڵگیری لە خۆیدا حەشارداوە.

بەڕاستیش – كاتێ بە شێوەیەكی ڕاست و دروست پێی دەگەین – بریتییە لە (خستنەڕووی) سیستمە ڕاستییەكە و ئەو عەقڵگیرییە كە خوای گەورەی بەدیهێنەر كردوونیەتە بەخشش بەسەر ئەم بوونەوەرەدا، كاتێكیش ئەقڵ دەكەوێتە گەڕان بە دووی دیاردە سروشتییەكان و بوونەوەردا، ئەوا لەو گەڕانەیدا بە نێویاندا بە دوای ئەو سیستم و ئەو عەقڵپەسەندییەدا دەگەڕێ، چونكە بەبێ سیستم و بیناكردن و عەقڵپەسەندی ناتوانین بگەینە شارەزابوون لە هیچ شتێك. مانای ناونانی شتیش – كە

بەبێ ئەو ناتوانین لە جیهان تێبگەین – ئەوەیە کە لە سیستمی شتەکاندا جێگایەکی گونجاو و مانایەکی شیاو بە خۆی پێبدرێ.

هەرجۆرە بوونێکی ناسەربەخۆی عەقڵ – کە قورئان پشتگیری لێدەکات – ئەو عەقڵگەراییە ڕاڤە دەکات کە بنەماکانی عەقڵپەسەندی دەخاتەڕوو و هەڵگۆزراون لە سیفەتە سەرەکییەکانی سیستمی بوون – بەم پێیە ئەوا (عەقڵگەرایی بەو سیفەتەی کە عەقڵپەسەندییە) بە ڕوونی جیاوازە لە چەمکەکانی ئێستای عەقڵگەرایی ئامێر ڕەنگ کە ئەرکی عەقڵ – گرنگترین و سەرەکیترین جیاکەرەوە لە مرۆڤدا – دادەڕنێ و لە کاری دەخات و دەیبەن بەرەو سوودوەرگرتنی لۆژیکی لە هۆکارەکانی بەردەست بۆ گەیشتن بە ئامانجە ئاشکراکانمان[1].

کەواتە عەقڵگەرایی ئەرکێکە بۆ بوون و بوونەوەر و بیرکردنەوە و لە میانەی کاری بەیەکگەیشتن و خودی ڕووندا ڕوودەدات. کاتێ دەگوترێ فلانە شت شتێکی عەقڵپەسەندە، ئەوە بەو مانایەیە کە سیستم و بیناکارییەکی دیاریکراوی هەیە و بە هۆیانەوە دەتوانین لێی تێبگەین، هەروەها مانای وایە کە مادامێ پەسەندی عەقڵە، ئەوا دەکرێ لە ڕێگای زمان و بەڵگە سەلمێنراوەکانی عەقڵەوە بگوێزرێتەوە بۆ کەسانی تر. ئەو میانە خودییە دیارەی عەقڵگەراییە کە قورئانی پیرۆز لە بۆنە جۆراوجۆرەکاندا جەختی لەسەر دەکاتەوە و عەقڵ و عەقڵگەرایی لەسەرووی کاری تاکەوە دادەنێ، کە تەنها بۆ زەینێکی خودی جیاکراوەبێ ، ئەمەش دەقاودەق وەك ئەوە وایە کە ئێمەی مرۆڤ بەشێکین لە حەقیقەتێکی گەورەتر، هەروەها بیرکردنەوەشمان لە دووتوێی میانەیەکی گەورەتری عەقڵگیریدا ئەرکی خۆی دەبینێ. قورئانی پیرۆزیش کە بەڵگە و نیشانەکانی خۆی ڕووندەکاتەوە بە شێوازی کۆ دەماندوێنێ (لقوم یعقلون)، ڕەخنەش لەوانە دەگرێ کە (الذین لایعقلون) (بۆ نموونە بڕوانە: (سورة البقرة: ١٦٤، سورة المائدة: ٥٨، سورة الرعد: ٤، سورة النحل: ١٢). هەروەها لە دۆزینەوە و خستنەڕووی کرۆکی عەقڵپەسەندی لە شتەکاندا بۆ پەیوەندییەکانی نێوان کلتوورەکان، ئەوا

[1] بڕوانە: میلتۆن ك. مۆنیتز. (مسألة الحقیقة)، برنستۆن، چاپخانەی زانکۆی برنستۆن، ١٩٩٠، ل١٢٤.

عەقڵگەرایی لە نێو تۆڕێك لە پەیوەندییەكاندا دادەمەزرێ و گەشە دەكات و باز دەدات بەسەر هەڵسوكەوتە ناوەكییەكانی عەقڵی مرۆییدا.

مەعلومە كە پۆلینكردنی عەقڵ لە دووتوێی میانەیەكی گەورەتری بووندا دژە لەگەڵ ئاڕاستەی سەرەكیی ڕەوتی عەقڵگەرایی نوێدا، هەر لەو كاتەوە كە سەردەمی ڕۆشنگەریی ئەوروپی وەرچەرخا بۆ دروشمی (عەقڵ كۆڵەكەی ڕاگیرە)، ئەویش گوایا لە بەرانبەر نا عەقڵانیەتی چاخەكانی ناوەڕاست ئیتر عەقڵ سەربەخۆیی خۆیی ڕاگەیاند و پەرەی دا بە دید و تێڕوانینی تایبەت بە خۆی، كە بنچینە و بناغەیەكی ڕەهایە و بوونێكە كە زۆرترینی ڕاستیی بۆ واقیع لەلایە. لە سەردەمێكیشدا كە عەقڵگەرایی بە كۆمەڵە تایبەتمەندییەك پێوانە دەكرێ كە قابیلی پێوانەكردن و بڕیاری بەرنامەیی ژمێریارییە، ئەوا بناغەكانی بوونی عەقڵ هەر لە ڕیشكەوە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، هاوكات شێوەكانی عەقڵگەرایی چارەسەركرا و بە یۆتوپیایەكی باڵا و، لە كۆتاییشدا نامرۆییی، دەستنیشان كراوە كە بنەما و بناغەی زیرەكی مرۆییە، بەڵام لە بەرانبەر چەمكی عەقڵگەراییەوە بەوەی كە دادەنرێ بە هێزێكی ژمێریایی، ئەوا گرنگترین نیشانەی تاقانە و ناوازەی مرۆییمان كە عەقڵە — ئەو تایبەتمەندییەی كە جیامان دەكاتەوە لە دروستكراوەكانی تر و بەشێوەیەكی ڕوون و ئاشكرا جیامان دەكاتەوە لێیان و فەزڵمان دەدات بە سەریاندا (سورة الإسراء: ٧٠) — هەر لە سەرەتا و بناغەوە و لە پلەی یەكەمەوە لە دووتوێی میانەیەكی كوالێتی و بەهاییدا ئەرك و ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ. ئەو تۆمەتانەش كە بە شێوەیەكی ناعەقڵانی و وشك و دەمارگیری بیروباوەڕییەوە دژ بە ئیسلام دەوترێن، بەشێكی ئەوەیە كە چەمكی عەقڵگەرایی بەو شێوەیەی كە لە كەلەپووری هزری ئیسلامییدا پەرەی سەندووە، دژ و جیاوازە لەگەڵ پاڵنەری سەرەكیی چەمكەكانی عەقڵگەرایی نوێ و لە پاش عەقڵگەرایی نوێیش كە لە خۆرئاوادا لە هەردوو سەدەی ١٧ و ١٨دا دەركەوت.

هەر بەپاڵنەری جۆش و خرۆشی ئایینیی زۆربەی مەسیحییەكانی چاخەكانی ناوەڕاست، ئیسلامیان بەوە ناوزەد كردووە دژی عەقڵە و تێڕوانینیان وابووە كە لەسەر

باوەڕی کوێرانە و نەزانی و توندوتیـژی و ئارەزووەکـانی دنیـا بونیـاد نـراوە، هـەر لـەو سەردەمەدا ڕایەکی چەوت هەبووە وتوویەتی ئایینی ئیسلام کە توانیویەتی ژمارەیـەکی زۆر لـە شـوێنکەوتووان بـەلای خۆیـدا ڕابکێـشێ، بـەو هۆیـەوە نـەبووە کـە تـوانیبێتی بەڵگەی سەلمێنەر و قەناعەتپێکراو پێشکەش بە شـوێنکەوتووانی بکـات، بـەڵکو لەبـەر ئەوە بووە کە گونجاو و تەبا و شـیاو بـە جەسـتەکانیان بـووە — کـە ئەمـەش نـزمترین بەشە لە کەسایەتی مرۆڤدا—. جگە لەمەش هاتوون وتوویانە ئایینی ئیـسلام پـشتگیری لە توندوتیژی دژ بە غەیرە موسڵمانەکان کردووە بەو مەبەستە تا بە زۆرەملێ بیانکاتـە موسڵمان، چونکە لە توانایدا نەبووە بەڵگەی سەلمێنەر و عـەقڵی پێـشکەش بـە غـەیرە موسڵمانەکان بکات و لـەو ڕێگایـەوە قەناعـەتیان پێبکـات، بـەکارهێنانی توندوتیـژی و ڕاگەیاندنی جیهاد دژ بە غەیری موسـڵمانان، ئـەوەی دەرخـستووە کـە ئیـسلام چـەندە ئایینێکی ناعەقڵانی بووە و تا چەندە دژ بووە لەگەڵ سروشتی شتەکاندا.

جێگـای سەرسـوڕمانیش نییـە کـە تۆمـەتبارکردنی ئیـسلام بـە ناعـەقڵانی و بـە توندوتیژی تا سەردەمانێکی نوێ هەر مایەوە، لە ئەمڕۆیشدا چەندین دەنگی دەمـارگیر و توندوتیژ دەخرێنە بازاڕ و ڕەواج بـە خۆیـان دەدەن تـا بەرانبـەرەکان دژ بـە ئیـسلام بووەسـتن و لێـی بتـۆقێن، هـەر هاوشـێوەی ئـەو ڕەخنانـەی تـری وەك ناعـەقڵانی و توندوتیژی کە ئیسلام و موسڵمانانیان پێ تۆمەتبار دەکرێن.

بەڵام دیارە کە مێژوو ڕۆڵی خۆی هەیە لە پرۆسەی هاوسەنگیدا، بۆ نموونە هەنـدێ لە ڕەخنەگرانی مەسیحی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا وەك (پیتەر بایل و هەنـدی سـتەب) بەرگرییان لە ئیسلام کردووە بەو سیفەتە کە ئاینێکە و لە کەنیـسەی کاسـۆلیکی زیـاتر نزیکترە لە عەقڵـەوە، هـاتوون بـە ئـایینی ئیـسلامدا هەڵدەدەن کـە ئـاینێکی ئاسـانە، ئەویش لە بەرانبەر ئاڵۆزییەکانی زانستی خواناسی و پەرسـتش و سـرووتەکانی ئـایینی مەسیحیەت، بە ڕاشکاوی گوزارشـت لـەو حاڵەتـە پێـشکەوتووە دەکـەن کـە لـە ژیـاری ئیسلامییدا هەیە. بـەڵام کەسـانێکی تـری وەك ڕۆجـەر بیکـۆن وا دادەنـێن کـە هـەردوو فەیلەسـوفی موسـڵمان (فـارابی و ئـیبن سـینا) کۆشـکی فەلـسەفییانەی خۆیانیـان بـە

نـاڕەزایی و بـە پێناخۆشـبوونی ئیـسلامەوە بونیـاد نـاوە، نـەك وەهـابێ کـە بـە هـۆی ئیـسلامەوە ئـەو کارەیـان کردبـێ. هـەردووکیان هـەر لـە ڕواڵـەت و بـە سـەرزارەکی ئیـسلامیان وەرگرتـووە بـۆ ئـەوەی خۆیـان بپـارێزن لـە چەوسـاندنەوەی ئاینێـك کـە لێبوردەیی نەبووە، ئەمە لە کاتێکدا وتراوە کە چەندین بیرمەنـدی دژ بـە کاسـۆلیکیەت لە چاخەکانی ناوەڕاستدا هەبوون و باوەڕیان وابووە کە ئیسلام زیاتر لە ئایینەکانی تـر ڕێگای داوە بە بیرکردنەوەی عەقڵانی و بە توێژینەوەی زانستی[٢].

ڕەخنەگرە عەلمانییەکان ئیسلام بەوە دادەنێن کە گوایا هەر لە بنەڕەتەوە گونجاو نییە لەگەڵ ڕۆحی مرۆییانەی عەلمانیەت بۆ مۆدێرنەیی، لێرەشـەوە دەڵـێن دژە لەگـەڵ بناغەکانی عەقڵانی زانستی کە پێویستییەکی ڕۆشنبیری و کلتـووریی نوێیـە. هـەروەها ئاماژەیان داوە بەو جیاوازییانە کە لە نێوان ئایینە کلاسیکییەکان و چەمکە نوێیەکانـدا هەیە کە پەیوەستن بە مافەکانی مرۆڤ و یەکسانی و ئازادییەوە، ئـەو عەلمانیەتـەی کـە دەم لە عەقڵی ڕۆشنگەریی سەربەخۆ و خودکەفایی دەکوتێ و لـە بەرانبەریـشەوە هـەر جۆرە دەستەڵاتێکی دەرەکی وەك مێژوو، یان کەلەپوور، یان ئایین ڕەتدەکاتەوە، ئـەو نایەت سەراپا کۆی ئایین ڕەت بکاتەوە، بەڵکو دەیخاتە ژێر لێکۆڵینەوە و توێژینـەوەی عەقڵی تاکی مرۆییەوە، هەروەها دێت سنوورێك بۆ باوەڕی ئایینی دیاری دەکات و ئیتر بـە هـیچ جـۆر قبـوڵی نییـە لـە دەرەوەی ئـەو سـنوورە ئـایین هـیچ جـۆرە ڕۆڵ، یـان دەستەڵاتێکی تری هەبێت.

هـەر لەسـەر هـەمان پێـودانگی ڕەخنـەگرانی چـاخەکانی ناوەڕاسـت، ڕەخنـەگرە عەلمانییەکانی ئەم سەردەمە ناعەقڵانی و توندوتیژی پێکەوە دەبەستن و دەیدەنە پاڵ ئایینی ئیسلام و دەڵێن (ترسـاندن و تۆقانـدنی ئیـسلام) دەرئـەنجامی سروشـتێکی نـا عەقڵانییە لە ئایینی ئیسلامدا. مسیۆنێرە (خۆرهەڵاتناسە) دەمارگیرییەکانیش هـاتوون

---

[٢] بڕوانە بابەتی: (ڕیشکی بەدحاڵیبوون: بۆچوونەکانی ئەوروپا – ئەمریکا لە بارەی ئیسلامەوە پێش ڕووداوەکانی ٩/١١ و پاشتریش، نووسەر. هەروەها: ئیسلام و ئوسوڵیەت و خیانەتکردن لە کەلەپوور، ٢٠٠٩، جۆزیف لۆمپارد. چاپی ٢، ل١٤٩ – ١٩٣.

شـتانی تریـشیان بـۆ لیـستی تۆمەتبارکردنەکـە زیـادکردووە، وەك: چەوسـاندنەوەی ئافرەت، پێشیلکردنی مـافی کەمینـەکان و ئـازادیی ڕۆژنامەگـەری، تەنانـەت هـەژاریی و گەندەڵیش و... تا دوایی هەر دەدەنە پاڵ ئیسلام. وا دادەنێن کە هەموو ئەم دیاردە و حاڵەتە نەرێیانە تا سنوورێکی زۆر پەیوەندییان بـە کەلـەپووری ئیـسلامەوە هەیـە، کـە بواری نەداوە خـەڵکی ئازادانـە بیربکەنـەوە و هـاتووە هـەموو لێکۆڵینـەوە و گـەڕانێکی ئازادانـە و جیـاوازی و فرەییـەکی سـەرکوتکردووە. لای کـەس شـاراوە نییـە کـە ئـەم شێواندن و گومانانە زیادەڕۆیی و دەمهەڵبەستنێکی زۆریـان بـۆ کەلـەپووری ئیـسلامی تێدایـە و لەسـەر بۆچـوونی سیاسـی بونیـادنراون نـەك وەهـابێ کـە پـشتی بـە شیکارکردنێکی ساغ و دروستی ڕووداوە مێژووییەکان بەستبێ.

زۆربەی زۆری ئەو مشتومڕ و تاوتوێکردنانەی کە ئەمڕۆ لە بارەی ئیسلام و عەقڵ و عەقڵگـەرایی و زانـستەوە دەکـرێن و لـە ناوەنـدە گـشتییەکانی خۆرئـاوادا دەهێنـرێن و دەبرێن، لە دەرئەنجامی کاریگەریی نەرێی ئەو کۆمەڵـە ڕاو بۆچـوونە سـادە و سـاکار و ناواقیعیانەوە سەرچاوە دەگرن تا کاریگەر بن و گوێشیان لێبگیرێ.

## میانەی نوێ: عەقڵی ڕۆشنگەر

مۆدێرنـەیی، لـە ڕێگـای سـەردەمی ڕۆشـنگەریی، وادادەنـێ کـە سـەرکەوتن و پێشکەوتنی بەسەر کەلەپوور و کـەلتوورە غـەیرە خۆرئاواییەکانـدا بەدەسـتهێناوە بـەو هۆیەوە کە دەڵێ گوایا شـتەکانی لەسـەر بنـەمای عـەقڵ بونیـادنراوە، کـە سـەرئەنجام ئەگەر سەراپا و پڕاوپڕیش نـەبێ، ئـەوا بەشـێوەیەکی سـەرەکی سیـستمێکی عـەقڵانی فەراهەمدێنێ.

جا بە پێچەوانەی ئەو بانگەشە گریمانەییانەوە کە بـۆ بـاوەڕی مەسـیحی دەکـرێن، گوایـا جیابووەتـەوە لـە عـەقڵ، ئـەوا فەیلەسـوفەکانی سـەردەمی ڕۆشـنگەری هـاتوون بەپێی گوتەکەی دیکارت کە دەڵێ (هزرە ڕوون و ڕۆشنەکان) بیانوویان هێناوەتەوە بـۆ هەر شتێ ویستبێتیان.

بەپێی ئەو پرسیارەی کە (کانت) لە گوتارێکی بەناوبانگیدا لە ساڵی ١٧٨٤دا وەڵامی داوەتەوە، بە کورتی تێیدا ڕۆڵی عەقڵ و عەقڵگەرایی خستووەتەڕوو کە دەبوو پەیوەندییان بەو ژیانەوە چۆن بێت کە دەبوایە لە جیهانی پاش چاخەکانی ناوەڕاست تێیدا بژین: پ: ئایا ئێمە لە سەردەمێکی ڕۆشنگەربوودا دەژین؟ کانت باوەڕی وابووە کە نەوەی سەردەمی خۆی لە (سەردەمی ڕۆشنگەری)دا ژیاون نەك وەها کە لە سەردەمێکی ڕۆشنگەربوودا ژیابن، جیاوازییەکی وردیش لە نێوان هەردوو دەستەواژەکەدا هەیە ناکرێ بەبێ بەها سەیر بکرێ و لاقرتییان پێبکرێ. سەردەمی ڕۆشنگەربوو ئەو سەردەمەیە کە هەموو ڕەگەزە دیارییەکانی کەلتوور و کۆمەڵگا و سیاسەت شوێنکەوتە و وابەستەی بنەمای عەقڵن، وەهایش کە ئەو دەڵێ ئەمە حاڵەتێکی کامڵە لە مرۆڤگەرایی و عەقڵگەرایی: جیهانێکە کە عەقڵ هەموو هێزە دژەکانی خۆی تێکدەشکێنێ. لە بەرانبەریشەوە سەردەمی ڕۆشنگەری ئەو سەردەمەیە کە دژایەتی و ململانێ و شەڕ بەرپا و بەردەوامە لە پێناو ڕۆحی مرۆییدا و دژ بە هێزەکانی نەزانی و تاریکی دەجەنگێ، کانت بۆ گەیشتن بە کامڵبوون و عەقڵگەرایی ئاماژە بە پرۆسەیەکی پلەبەندی دەدات: ئامانجێکە و هەموو مرۆڤایەتی بەرەو ئەو ئامانجە هەنگاو دەنێ. جا بەو پێیە کە سەردەمی عەقڵ دەستیپێکردووە، ئەوا کۆتایی مێژوو لە بەردەستماندایە — کۆتاییەکە و هیچ گومانی تێدا نییە کە بەڕێوەیە و لە پێشماندایە، ئەویش ئەو کاتەیە کە ڕووناکیی عەقڵ بەسەر تەواوی مرۆڤایەتیدا هەڵدێ و بەدەر لە ئەوروپییەکان ئیتر سەراپای ئەوانی تر دەگرێتەوە.

کانت وشەی (ڕۆشنگەری)ی بەوە پێناسە کردووە کە: (ڕزگاربوونی مرۆڤە لەو راسپاردە کۆت و بەندکارە کە بەسەر خۆیدا هێناوە، ڕاسپاردەی کۆت و بەندکاریش بریتییە لە نەتوانایی مرۆڤ لە پەنابردن بە تێگەیشتنی خۆی دوور لەوە کە ڕێنمایی لە کەسانی ترەوە وەربگرێ). کانت پەی بەوە بردووە کە مرۆڤ تێنەگەیشتووە لە زۆرێك لەو ستەم و نەزانییانە کە مێژووی مرۆڤایەتی پێکدەهێنن. هەروەها هاتووە کرۆکی ڕۆشنگەری بەوە پێناسە کردووە کە بریتییە لە (جورئەت بەخۆدان لەسەر بیرکردنەوە)

بە شـێوەیەکی ئازادانـە. (Sapere aude! واتـە: جورئـەت بـدەی بـە خـۆت لەسـەر بەکارهێنانی عەقڵی خۆت! هەر ئەمەش دروشمی ڕۆشنگەرییە)[٣].

ئەم بۆچوونانە لـە نێـو نێوەنـدە ئەکادیمییەکانـەوە گوێزرانـەوە بـۆ نێـو نێوەنـدە جەماوەرییەکان.

لـە ئـەمڕۆدا مـشتومڕکردن دەربـارەی عـەقڵی ڕۆشـنگەری بووەتـە مـشتومڕکردن دەربارەی ئەو هـەژاری و کەمدەسـتییە فیکرییـەی کـە گوایـا دەڵـێن ئیـسلام لـە ڕووی عەقڵگـەرایی و مرۆڤگەراییـەوە کەمتفاقـە و هـەژارە. لـە کاتێکـدا لـویس دۆبریـە واقـی وڕمابوو لەو هێرشـانەی لـە ٢٠٠١/٩/١١دا ڕوویانـدا، لـە پێشەکی ئـەو کتێبەیـدا کـە لـە بارەی مێژووی پرشنگداری سەردەمی ڕۆشـنگەرییەوە نووسـیویەتی، پرسـیار دەکـات، دەڵێ: (ئایا چ مەبەستێك دەمێنێتەوە لە نووسـین دەربـارەی سـەردەمی ڕۆشـنگەری و سـوودمەند دەبـێ لـە سـەردەمێکدا کـە بـە شـێوەیەکی زۆر دڕندانـە ڕایدەگەیـەنێ کـە کۆتایی بە بەها و نموونە باڵاکان دەهێنێ). دۆبریە لەم گوتەیدا مەبەستی ئەوە نییە کە کـەلتووری ئیـسلامیی (ناڕۆشـنگەرکارە). بـەڵام نووسـیویەتی و دەڵـێ: (ئیـسلام بـە قۆنـاغێکی دوورودرێـژی تاقیکردنـەوەی ڕەخنـەئامێزدا تێنەپـەڕیوە، هـەروەك چـۆن خۆرئاوا لە ماوەی سەدەی هەژدەمدا بەو قۆناغەدا تێپەڕیوە تا ڕاست و دروستی دیـد و بۆچوونی ڕۆحی خۆی بسەلمێنێ)[٤]. ئیتر دۆبریە نەهاتووە ئەوە ڕوون بکاتەوە کـە ئایـا بۆچی ئیسلام پێویستی بەوەیە پێداچوونەوە بکات بە (دروسـتی تێـڕوانینی ڕۆحیانـەی خۆیدا)، بەڵام چەند جارێ بە ڕوونی ئەو تێڕوانین و بۆچـوونە کـە زۆر بـاوە لـەوەی کـە ناو دەبرێ بە (چاکسازیی ئیسلامی)، دووبارە دەکاتەوە.

---

[٣]- ئیمانوئێل کانت (ڕۆشنگەری چییە؟) لە کتێبـی (کانـت: لـە بـارەی مێـژووەوە)، ن: لـویس وایـت بیـك، کۆمپانیای ماکمیلان بۆ بڵاوکردنەوە، ١٩٦٣، ل٣).

[٤]- لویس دۆبریە (سەردەمی ڕۆشـنگەری و بنـەما هزرییـەکانی کلتـووری نـوێ)، چـاپخانەی زانکـۆی بیـل، ٢٠٠٤، پێشەکییەکەی.

له هەمان کاتدا چەند دەنگێکی زۆر وەڕس و نیگەرانکەری تر هەبوون بانگەشـەیان بـۆ (ڕۆشـنگەریی ئیـسلامی) دەکـرد تـا موسـڵمانان ڕزگـار بکـات لـە دواکـەوتوویی و جیهانیش بپارێزن لە ئاینێکی ناعەقڵانی و مەترسیدار.

یەکێك لەو هەڵانەی کە زۆر زەق و باوە، ئەو بۆچوون و گریمانەیەیـە کـەوا دادەنـێ لە سەدەی هەژدەهەمـەوە عـەقڵ نیـشانە و سـیمایەکی تایبـەتکراوە بـە بیرکردنـەوەی ڕۆشنگەری، لە ڕاستیدا وانییە، چونکە کۆمەڵگا کلاسـیکییەکان لـە بوارەکـانی زانـستی خواناسی و یاسا و سیاسەت و ڕەوشت و هونەر و بوارەکانی تری ژیـانی مرۆڤایەتییـدا، پێگە و پلەیەکی گرنگیان بە عەقڵ داوە.

بۆ نموونە کەلەپووری هزری ئیـسلامیی دەبیـنین کـە پەرتوکخانەیـەکی زەبـەلاحی دەربارەی عەقڵ و عەقڵگەرایی و لۆژیك و بیرکردنەوە و تێڕامان و توێژینەوەی زانـستی و... تا دوایـی هەیـە و لـەو بوارانـەدا چـەندەها پـەرتوك دانـراون، هـەر لـە کەلـەپووری هەردوو ئایینزایی سوننە و شیعەوە بگرە تا فەلسەفەگەرایی و سۆفیەتی پڕن لە کتێبی دێرین و ڕەسەن کە چەندین بەشیان تێدایە باس لە شـەرەفمەندیی عـەقڵ و چاکەکانی زانستخوازی و فەڕ و بەرەکەتی ڕۆحی دەکەن، ئەمەش هەموو بەو مەبەستە تـامرۆڤ بـە شێوەیەکی گونجاو و سوودگەیەنەر عەقڵی خۆی بەکاربهێنێ. جـا وێـڕای ئەمـەش ئـەوا ئەو چەمکانەی لە بارەی عەقڵ و عەقڵگەراییەوە لـەو کەلـەپوورەدا پـەرەیان پێـدراوە، هەر لە بناغەوە جیـاوازن لـە هاوشـێوە مۆدێرنەییـەکانیان. کۆمـەڵگا کلاسـیکییەکان وا دەبیـنن کـە عـەقڵ بەشـێکە لـە واقیـع و لـە مـەودا گەورەترەکەیـدا، ئیـسلام عـەقڵ و عەقڵگەرایی دەخاتە دووتوێی میانەیەکی فراوانتری بوون و ماناوە. جا بۆ ئەوەی عەقڵ بەو شێوەیە کەلێی خوازراوە ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، دەبـێ شـوێنگەی خـۆی لـە نێو سیستمی شتانێکی گەورەتر لـە خـودی ناسـراوی خـۆی پەسـەند بکـات. هـەروەها بەپێی ئەو باسەی کە لەمـەوپاش دێمـە سـەر مـشتومڕکردن لەسـەری، قورئـان عـەقڵی مرۆیی دادەنێ بە بەشێك لە واقیعێکی گەورەتر، ناشکرێ حیکمەتی ئـەو کـارە گـەمارۆ بـدرێ و لـە دووتـوێی شـیکارێکی لـۆژیکی، یـان چـەمکێکی ڕووت، یـان گوتـارێکی

عەقڵانییـەوە بخرێتـە بەرچـاو، چـونکە حیکمـەتی سـەرمەدیی ئـەوەی خواسـتووە کـە هەمیشە واقیع گەورەترە لە تەنها پێکهاتە مەعریفییەکانی ئێمە بۆی.

ئەوەیش کە عەقڵ نیشانەیەکە لە نیشانەکانی مۆدێرنـە، ئـەوا وەهـا وێنـاکراوە کـە بنەمایـەکی خودڕێکخـەرە و هـەر لـە زانستە بیرکـاری و فیزیکییەکانـەوە تـا سیـستمە کۆمەڵایـەتی و سیاسـییەکان فەرمانڕەوایـە بەسـەر ڕاسـتیەوە. یـەکێ لـەو دەسـتەواژە نوێیانـەی کـە بـە شـان و بـاڵی عەقڵدا هەڵدەدات، دەڵـێ: (مانـای چـاکە و گـەورەیی عەقڵگەرایی ئەوەیە دان بنـرێ بـە عەقڵدا و پەسـەند و قبـوڵ بێـت بـەو سـیفەتەی کـە سەرچاوەی مرۆڤە بۆ فێربوونی زانـست و تاکـە ناوبژیوانـە بەسـەر بەهاکانـەوە و تاکـە ڕێنماکارە بۆ کردارەکان)[٥].

بـەڵام لـە واقیعـدا ئـەم تێـڕوانینی توێـژی ڕۆشـنبیرە لـە بـارەی عەقڵـەوە – کـە فەیلەسـوفە ئەکادیمییـە وەزعییـەکان و لەوانـەش کـە خۆیـان بـەوە ڕاگەیانـدووە شـوێنکەوتەی ڕێبـازی عەقڵگـەرایی ڕۆشـنگەریین، بـە جـۆش و خرۆشـێکی بـەرزەوە بەرگری لێدەکەن – کە وەها پێشبینی لێکراوە هەرگیز کاری نەکردووە، ئەو بەڵێنانەی کە دابوونی، نەیبردوونە سەر، واتە بەڵێنی دانی ئازادی بە تاکـەکان، یـان بـەعاقڵکردنی کۆمەڵگا، یان یەکسانیی گشتگیر، یان کلتووری زانستی، یان پابەند بوون بـە عەقڵـەوە لە کاری سیاسی، یان لە دادگەریی ئابووریدا، خودی ئەمـەش خـۆی ئـەوە داوا دەکـات کە تێڕامـان و سـەرنجدانێکی قـووڵ دەربـارەی عـەقڵ پەسـەندی پـرۆژەی ڕۆشـنگەری تایبەت بە خودی عەقڵی ڕووتەوە بکرێ. بەهەرحاڵ وا دەردەکەوێ کە چەندین توخمی ناعەقڵانیـەت ڕژاونەتـە نێـو ئـەو سیـستمە نـوێ جیهانییـەوە کـە ڕۆشـنگەری بـەڵێنی بەهاتنی داوە، ئەوەی ڕاستی بێت کۆمـەڵگای سـەرمایەداریی نـوێ و بـەو ڕەوتـە بـەناو ناپەسـەندیی کەسـایەتی فێڵبـاز و تاکڕەوییانـە و بونیـادە توندوتیژییەکەیـەوە تـەواو دوورە لە سیستمێکی کۆمەڵایەتیی عەقڵانییەوە.

---

[٥]- ئیبن ڕاند (چاکەی خۆشویستنی خود)، کتێبخانەی نوێی ئەمریکی، ١٩٦٤، ل٢٥.

لــەو ســەردەمەوە کــە ڕێبــازی زانــستی لــە کۆتاییــەکانی ســەدەی نۆزدەهــەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە سەرکەوتووە، ئـیتر بانگەشـەکردن بـۆ عـەقڵ پـچڕیی تێنەکەوتووە، بەو سیفەتە کە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی مۆدێرنەیی، ئەویش هـەروەك لۆژیك و توێژینەوەی عەقڵانی وایە، ئەویش نـەك بـەو هۆیـەوە کـە ئێمـە دەمانـەوێ بـە مانای ئەغریقی وشك لە حەقیقەتی شـتەکان تێبگـەین، بـەڵکو بـە هـۆی بـاوەڕبوون بـە سیستمێکی عەقڵانی ڕووت کە وامـان لێـدەکات جلـەوی کـۆنترۆڵکردن بەسـەر جیهانـدا بگرینە دەست. هەروەها پێشکەوتنی عەقڵگەرایی ئامێریی کە پلانڕێـژی بـۆ بـەهاکان و سیــستەمە فێرکــاری و سیــستەمە سیاســی و ژیــانی ڕۆژانــە دیــاری دەکــات و دەبێتــە پاسـاوێکی ئامـادەکراو بـۆ زاڵبـوون و پێـشبینیکردن و هـەژموون فەراهـەم دێـنێ و تـا ســنوورێکی گـــەورە مانایـــەکی درۆزنانـــە بـــە ئاســـایش و ڕەزامەنـــدی و تێربـــوون دەبەخشێت[٦]. ئەو بەبێ دوودڵـی دەڵـێ کـە شـتەکان بایـەخێکی بەرچاویان هەیـە لـەو ڕووەوە کە بەهایەکی سوودمەندیان بۆ ئێمە هەیە، چونکە (عەقڵانی) واتـە (بەسـوود). نە عەقڵگیری و نە کرۆکی عەقڵگەرایی نادرێنە پاڵ شتەکان، بەڵکو ئەوشتانە بەهایەکی سوودمەندیان هەیە و ئێمەش ئازادین لە سوودوەرگرتن لێیان، هەر بەو شـێوەیەش کـە خۆمان دەمانەوێ.

لە سەردەمی نوێیشدا عەقڵ هەر لە نێوان توندڕەوەکانی ڕەوتی لـۆژیکی وەزعـی و نێوان ڕەوتی مێژوورییەتی ڕادیکاڵیدا ئەمبەر و ئەوبەری پێکراوە، ڕای یەکەم کە ئەڵقەی ڤێننا و شوێنکەوتووانی نوێنەرایەتی دەکەن، عەقڵ بەوە ڕاڤـە دەکـەن کـە بنەمایـەکی ڕەها و ئەزەلییە و هیچ یەك لە مێـژوو، یـان داب و نەریتـەکان، یـان ڕەنگپۆشـبوون بـە نیـشانەکانی لاوازیـی مرۆیـی وەك سـۆز و حـەزلێکردن، کاریگـەرییان لەسـەری نابێـت. عەقڵگەراییش بە مانایەکی ساکار واتە بسەلمێنرێ کە چەمکەکانمان دەقاودەقن لەگەڵ واقیعدا، هەروەها واتە دەرهێنانی دەرئەنجامێك کە گونجاوە لەگەڵ ئـەو ڕوداوانـەدا کـە لە بەردەستماندان، جـا بـەم واتایـە ئـەوا عەقڵگـەرایی هـەر لـە بناغـەیـەوە بریتییـە لـە

[٦]- ئەلبێرت بورگمان (پەڕینەوەی بۆشایی پاش مۆدێرنە)، شیکاگۆ، چاپخانەی زانکۆی شیکاگۆ، ١٩٩٢.

(پێکـــەوە بەســـتنێکی لـــۆژیکی) و ڕۆشـــنترین گوزارشتلێکردنیـــشی بریتییـــە لـــەو گوزارشتلێکردنەی کە لە لـۆژیکی ڕووالـەتی و پێـڕەوی زانـستیانەدا هـاتووە[٧]. نـەك لـە ڕێگای پێوەری ترەوە کە دادەنـرێن بـە بناغـەی عەقڵگـەرایی، هـەروەها دەبـێ بـەپێی نووسین و پڕکردنەوەی سەپێنەری لۆژیکی و زانستییەکانەوە بۆ ئەم عەقڵە نامێژوویـیـە حوکمبـدرێ بەسـەر هـەموو شـتێکدا، هـەر لـە ئاییـنـەوە بیگـرە تـا دەگاتـە هونـەر و فێرکردن.

پاشانیش دەبێ هەموو ئەو بەهایانەی کە لەسەرمانە پێیانـەوە بـژین، لـەو ڕووداوە سروشـتیانەوە وەربگـرین کـە پێویـستە لـە ڕێگـای توێژینـەوەی عـەقڵانی و شـیکاری لۆژیکییەوە بە دوایاندا بگەڕێین، ئیتر جگە لەمانە ئەوا دەبێ هەر شتێکی تر بە پڕوپوچ لە قەڵەم بدەین، واتە ئەو غەیبی و نادیارە کە نابینرێ ڕەتـی بکەینـەوە. جا هـەروەك بوون ئەویش چوون لۆژیکی ڕواڵەتی داڕنـراوە و کراوەتـە ئـەرکێك بـۆ بەڵگەهێنانـەوەی عەقڵی، هەروەها داڕنـراوە بـۆ زاراوەیـەکی لـۆژیکیی بێبەڵگـە و بێمانـا و لـە دەرەوەی پێکهاتە لۆژیکییە زمانەوانییەکانەوە هیچ هێزێکی تر بوونی نییە[٨].

بـــەڵام ڕای دووەم کـــە شـــەپۆلەکانی پۆســـت مۆدێرنـــەیی و ڕەوتـــی بـــەننائی لـــە شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە نوێنەرایەتی دەکەن، هاتووە عـەقڵی شـیکردووەتەوە و هەڵیوەشاندووە بە پلەیەکی وەهـا کـە گۆڕیویـەتی بـە بەرهەمهێنـەرێکی لاوەکـی بـۆ ڕەوتە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە مێژووییەکان، ئەمەش حاڵی هەموو سیفەت و پاڵنـەرە مرۆییەکانە کە لە ڕووی مێژووییەوە عەقڵ بە چەمکێکی بـەننائی لـە قەڵـەم دەدات کـە مانا و ئەرکەکەی لە نێوەندێکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ نێوەندێکی تر جیاوازە. لای ئـەمان

---

[٧]- چارلز تایلۆر، (عەقڵگەرایی) لە کتێبەکەیدا (فەلسەفە و زانستە مرۆییـەکان)، بـەرگی ٢. کامبریـدگ، چاپخانەی زانکۆی کامبریدگ، ١٩٨٥، ل١٣٤.

[٨]- هایدگەر ئەو مانا کەموکورتە بۆ مانای (لۆگۆس) ڕەتدەکاتەوە، کە گوتار یان شیکاریێ بێ بەبێ بناغـەی هەبوونی، هەوڵیداوە لە جیاتی ئەمە مانا یۆنانییـە ڕەسـەنەکە بـۆ وشـەی لۆگـۆس بگێڕێتـەوە، کـە ئـەویش (کۆکردنەوەی خستنەپاڵە)، بڕوانە کتێبەکەی: (دەروازەیەك بۆ میتافیزیك) ل١٢٠ – ١٣٥، چاپی ١٩٥٩.

عەقڵگـەرایی واتــە پڕاکتیزەکردنــی توانــای بیرکردنــەوەی مرۆیــی لەســەر بارودۆخــە جۆراوجۆرەکان بۆ چارەسـەرکردنی گرفتـەکان، کـە تـەنها لـە میانـەی کێشەکان، یـان گرفتەکان، یان مەسەلە دیاریکراوەکاندا مانای هەیە، جا بە پشتبەستن لەسەر جۆرەهـا پێداویـستییە مرۆییــەکان ئــەوا عەقڵگــەرایی واتــا و ئــەرکی نــوێ لــەخۆ دەگــرێ، بەرگریکارانی ئەم ڕا سنووردارەی عەقڵ پێدادەگرن کە ئەمە بەو مانایـە نییـە لـە پلـەو پایەی عەقڵ کەمبکرێتەوە، یان میتۆدێکی ناعەقڵانی بۆ ئەنجامدانی شـتەکان پێـشنیار بکرێ، بەڵکو لە جیاتی ئەوە دێت ئیقرار بـە سـنووردارییی عـەقڵی مرۆیـی دەکـات، بـەم واتایەش ئەوا مەرج نییە عەقڵگەرایی بە مانای دەستخـستنی ئـەنجامێکی گونجـاو بێـت بۆ واقیع. بارودۆخی وەهاش هەیـە کـە پرەنـسیپی (هەرشـتێکی پەسـەندکراو) هـەژمار دەکرێ بە بەکەڵك و بە پـۆزەتیڤ زۆرتـر لـە هەنـدێ چـەمکی دامـاڵراو و بیرکارییانـەی عەقڵ[٩].

چەمکی عەقڵ لە کەلەپووری ئیسلامیدا ڕێڕەوێکی جیاوازی هەبووە و هەیە، خـۆی بـە دوورگرتـووە لـە تونـدڕەویی هـەردوو ڕەوتەکـە، ڕەوتـی ڕەهـایی وەزعـی و ڕەوتـی ڕێـژەیی ڕادیکـاڵی. ئـەو عەقڵـەش کـە لـە دووتـوێی تێـڕوانینی ئیـسلامدا بـۆ جیهـان پەروەردە بووە، شێوازێکی جیاواز لە بیرکردنەوەی لـەبارەی بـوون و بونـەوەر و بـاری مرۆییانــە و خــوا خــستووەتەڕوو، تێــڕوانینی ئیــسلام لــە جیــاتی ئــەوە عــەقڵ بــە پرەنسیپێکی خودڕێکخەر و بە ئامێرێك کـە بـە خـۆی خـۆی ڕابگـرێ لـە قەڵـەم بـدات، هاتووە دایناوە بە بەشێك لە حەقیقەتێکی گەورەتر. لەمەو پاش دێمە سـەر باسـکردنی ئەو باسە، جا هەر ئەم تێڕوانینە تەواو و کامـڵ و گـشتگیرەی هەقیقەتەیـە کـە بووەتـە بناغەی شێوازی قورئانی بۆ بیرکردنەوە لە عەقڵ و عەقڵگەرایی.

---

[٩]- پاول فییەرانبد لـە کتێبـی (دژی میتـۆد)، ١٩٧٥، هـەروەها: تـیڤن تـولیمن لـە (گەڕانـەوە بـۆ عـەقڵ) کامبریدگ، چاپخانەی زانکۆی هارڤارد، ٢٠٠١.

## عەقڵی بەڵگەگەیەنەر (إستدلالی) و عەقڵی مەعریفی

بەرلەوە بچینە سەر ئەم باسە، باش وایە چەند وشەیەکی ڕوونکردنەوە دەربارەی ئەو دابەشبوون و فرە لق و پۆپەی بەسەر عەقڵ — هزردا هات کە لە بەرئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە فەلسەفییە گرنگەوە بەسەر مێژووی میتافیزیکیی خۆرئاواییدا هات، لە جێگای خۆیدا باس بکەین. منیش لێرەدا سەرچڵی ناکەم بچمە قووڵایی ئەو مێژووە، چونکە ئەوە پێویستی بە چارەسەرێکی درێژ و وردەکارانە هەیە، بەڵام شایانی ئاماژەپێکردنێکی کورتە بزانین کە لەو مێژووەدا عەقڵی بەڵگەگەیەنەر و عەقڵی مەعریفی لە کۆتاییەکانی چاخەکانی ناوەڕاستدا دەلالەت لە دوو میتۆدی جیاواز بۆ تێڕوانین لە واقیع دەکەن. لەو سەردەمەوە ئیتر هەریەك لەم دوو وشەیە ڕێگای جیاواز بەخۆی گرتەبەر. وای لێهات کە بەکارهێنانی عەقڵی بەڵگەگەیەنەر تایبەت کرا بە شیکاری لۆژیکی و داماڵین و هەڵێنجان و دەستخستنی ئەنجام و چەندین ئەرکی لۆژیکی تری عەقڵ. بەم مانا فراوانەش، ئەوا هەر لە بنەماوە عەقڵی بەڵگەگەیەنەر بووەتە سەرچاوەی مەعریفەی زانستی و بانگەشەی وردبینی و گومانبڕی کردووە. لە بەرانبەریشەوە عەقڵی مەعریفی هاتووە تا ئاماژەیەك بێت بۆ زانستی هەڵهێنان و زانستەکانی دانایی، کە ئێستا بە تەواوەتی جیاکراوەتەوە لە کەشماڵکردنی عەقڵانی و شیکاری لۆژیکی، لە ماناشدا بەوە دادەنرێ ئەو بناغە پتەوەی نییە کە عەقڵی بەڵگەگەیەنەری لەسەر بونیاد نراوە، چونکە عەقڵی مەعریفی قسە لەسەر کۆمەڵێ وشەی خودی دەکات وەك هەڵهێنان و بۆچوون و هەڵهاتن، بەڵام نە سەلماندن و نە بەڵگە و نە دڵنیاکردن بوونیان نییە.

ئەگەر پاشتر ئەو جیابوونەوەیە لە نێوان ڕێبازی سروشتی و عەقڵانی و هزری ڕۆحانی لە کەلەپووری خۆرئاوادا ڕوویندایە، ئەوا دەکرا تەنها جیاوازییەکی خەملاندن بووایە. لە واقیعیشدا کەلەپووری (تۆماوی) پارێزگاریی لەو پەیوەندییە تەواوکارییە کردووە کە لە نێوان عەقڵی بەڵگەهێنەر و عەقڵی مەعریفیدا هەیە، وا دەبینێ کە ئەو

دوو عەقڵە دژ بە یەك نین، بەڵكو هەریەكەیان باس لە چەندین لایەنی جۆراوجۆر بۆ هەمان حەقیقەت دەكەن[10].

بەڵام هەروەك پاشتر مێژوو دەریخست، ئەوا هەریەك لە هەردوو دەستەواژەكە هەر لە ڕیشكەوە وێنای میتۆدێكی تەواو جیاواز بۆ تێگەیشتن لە جیهان دەكەن و هاوكات هەریەكەیان دادوەریی ڕەوشتی تایبەت بە خۆی ڕادەپەڕێنێ.

عەقڵی بەڵگەیەنەر بووە ئامرازی سەرەكیی ئەو زانستە سروشتیانەی كە پێشتر سروشتیان داماڵیوە لە هەر جۆرە عەقڵگیرییەكی بنەڕەتی و مانایەكی هێمایی كە پێیەوە دەناسرایەوە، هەروەها پەرەیدا بە شێوازی كاركردن بە جیا، هەروەها دوورییەكی تر لە نێوان عەقڵی بەڵگەیەنەر و عەقڵی مەعریفیدا بەدی دەكرێ، ئەویش ئەوەیە كە عەقڵی بەڵگەیەنەر شیكاری عەقڵانی بە ئیشی خۆی نەزانیوە تا بێت پەردە هەڵماڵێ لەسەر ئەو عەقڵگیرییەی لە نێو شتەكان، یان مانا هێماییەكان، یان بەها ڕۆحییەكانیدا خۆی حەشار داوە. عەقڵگەرایی ئاستێكی نوێی تایبەت بە خۆی بۆ حەقیقەت دۆزییەوە كە ئەزموونی گشتگیرمان بۆ واقیع دەچێتە نێو ئەو ئاستەوە، ڕەوتی عەقڵگەرایی پشتئەستوور بە هەردوو ڕەوتی سروشتی و وەزعی (پۆزەتیڤی) هەوڵیداوە واقیع داڕنێ بۆ لێهاتن و پسپۆڕییە شیكارییەكانی زەینی مرۆیی، هەر لێرەوە هاتووە بیركردنەوەی چەندی – ژمێریاریی بەوە داناوە كە تاكە میتۆدی باوەڕپێكراوە بۆ زانینی واقیعی شتەكان.

جا هەرچەندە كەسانێ لە لاهوتە (زانیانی خواناسی) مەسیحییەكانی ئەم سەردەمە پێدادەگرن لەسەر ئەوە كە هەردوو عەقڵی بەڵگەیەنەر و (إستدلالي) و عەقڵی مەعریفی پێكەوە ڕێڕەوێكی ڕاست بۆ دەستخستنی مەعریفە پێكدەهێنن، بەڵام فرەبەشی جۆرەكانی بیركردنەوەی گوتاری و هەڵهێنان ڕۆڵێكی سەرەكییان گێڕاوە لە بەعەلمانیكردنی وێنەی نوێی جیهان و داماڵینی پیرۆزیی لە سروشت.

---

[10]- دینیس تورنەر، كتێبی (باوەڕ و عەقڵ و بوونی خوا)، كامبریدگ، چاپخانەی زانكۆی كامبریدگ ٢٠٠٤، ل٧٥ – ٨٨.

له کەلەپووری ئیسلامییدا هەرگیز جیاوازیی لەمجۆرە ڕوویندەداوە، چونکە وشەی (عەقڵ) هەردوو ماناکە دەگرێتەوە کە پێشتر قسەیان لەبارەوە کراوە، عەقڵیش بە سروشتی خۆی لە توانایدایە بەبێ جیاوازی هەردوو ئەرکی شیکاریی لۆژیکی و مەعریفەی هەڵهێنان ئەنجامبدات. لە سەرووی ئەمەشەوە ئەوە هەر خودی عەقڵە کە لە هەڵبژاردە ڕەوشتییەکانماندا ئاڕاستەی ویست و ئیرادەمان دەکات. ڕاستە لە کەلەپووری ئەمدواییانەی هزری ئیسلامییدا فەیلەسوفەکان جیاوازییەکی گشتییان خستووەتە نێوان توێژینەوە و زەوق واتە زانستی هەستپێکراو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوا هەردوو شێوەی بیرکردنەوەکە دەبنە تەواوکاری یەکتری و دەبنە یارمەتیدەرمان بۆ دۆزینەوەی پەیکەری ئەو واقیعە فرەچینە کە لە کۆتاییدا داوای لە یەك نزیککردنەوەیەکی فرەڕەهەند دەکات، بەڵام نزیککردنەوەیەکی تەواوکار. ئەم چەند وشەیەی مەلا صەدرا کە دەڵێ: (سەلماندنی هەقیقی پێچەوانە نییە لەگەڵ بینراوی بەرچاودا) بەرجەستەی ئەم کەلەپوورە ئیسلامییە دەکەن[11].

کاتێکیش موسڵمانان لە ژێر فشاری عەلگەرایی نوێدا و لە بەرئەنجامی گرێی دەروونی خۆبەکەمزانی لە بەرانبەر خۆرئاواوە لێدوانیان داوە کە (ئیسلام ئاییني عەقڵە)، مەبەستیان لەم تێڕوانینە ئەوە نەبووە کە ئاییني ئیسلام، یان هەر ئاینێکی تر دابڕن لە مەبەستی خۆی و بێن بیکەن بە کالاّ بە بالاّی عەقڵی مرۆییدا. ئەمجۆرە بانگەشەیە لە باریدایە ئایین بگۆڕێ بۆ ڕوونکردنەوەیەکی ئەزموونی، یان بۆ دۆزێکی لۆژیکی. دەبێ ئایین – لە ڕووی پێناسەکردنەوە – ڕەهەندێکی هەبێت کە عەقڵ تێپەڕێنێ، ئەگەر نا ئەوا پێویست ناکات بە وەحی پەروەردگارێتی و پێغەمبەران. بەڵام کاتێ ئایین عەقڵ تێدەپەڕێنێ ئەوە بەومانایە نییە کە دژی عەقڵە، بەڵکو بەو مانایە دێ کە لە سەرووی – عەقڵگەراییەوەیە و لە سەرووی توانا مەعریفییەکانی عەقڵی مرۆڤەوەیە. لە سەرووی– عەقڵگەرایی مانای ئەوە نییە کە ناعەقڵانییە، چونکە عەقڵ

[11] - مەلا صەدرا (الحكمة المتعالية في الأسفار العقلية الأربعة)، بيروت، دار إحياء التراث العربي، ١٩٨١، الجزء الأول، ص٣١٥.

له توانایدا هەیه دان بنێت بەو شتەی کە هەیە و لە دەرەوەی توانای عەقڵەوەیـە، ئـەم ئیقرارپێکردنە نـاکۆك و پێـچەوانەی لۆژیـك نییـە، چـونکە عـەقڵ بـە نـەزانی و نـازانم و بـاوەڕی کوێرانـە ئیقـرار ناکـات بـە شـتەکان، بـەڵکو ئـەو دانپێدانانـە لـە بەرئـەنجامی تێڕامـانێکی خودییـە و لـە توانـای سـنووری خۆیدایـە، عـەقڵیش بـەبێ ڕێـسا و بنـەما دیاریکراوەکان ناتوانێ بیر بکاتەوە، ئازادیش مانـای ئەوەنییـە هـەموو بەنـد و مـەرج و ڕێساکان بسڕێتەوە، بەڵکو بریتییە لە بەکارهێنانی عەقڵ شانبەشانی چاکەکاری[١٢].

هەر تایبەت بـە عـەقڵی مرۆیـی شـتێکی تـر کـە تیایـدا نـاوازە و سەرسوڕهێنەرە، ئەوەیە کە دەربارەی ئەو شتە کە لە توانایدایە بیزانێ و ئەو شتەش کە لە توانایدا نییە بیزانێ خۆی کـۆت و بەنـد بـە خـۆی دیـاری بکـات. ئـەم سـنووردارکردن و دیاریکردنـە خودییە کارێکی عەقڵانییە و ئاماژەیە بۆ میانەیەکی فراوانتر بۆ بوون و عەقڵگیری، ئـەو بوونە کە عەقڵ لە نێویدا بە ئەرکی خۆی هەڵدەستێ و جێبەجێی دەکات، هەر ئەمـەش بوو پێشەوا غەزالی هەوڵی بۆدا کاتێك کە هات ڕەخنەی لە فەلسەفەی (مشائي) گرت.

پێشەوا غەزالی هەوڵیداوە لە بـواری مەسـەلە غەیبییـە ڕووتەکانـدا بـە شـێوەیەکی ڕەخنەگرانە سنووری عەقڵی تیۆری بکێشێ، غەزالی باوەڕی وابوو ئەو سنوورە سەر بە جیهانی نادیارە (غیـب). هـەروەها (کانـت)یـش – خـۆی پابەنـد کـردووە بـە ئـەرکێکی هاوشـێوەی ئەرکەکـەی غـەزالی، بـەڵام بـە کـارکردن بـە پێـشەکییە لۆژیکییـە جۆراوجۆرەکان – لە کتێبەکەیدا بە ناوی (نقد العقل المحض – ڕەخنەگرتن لـە عـەقڵی ڕووت) هەوڵیـداوە سـنوورێك بـۆ عـەقڵ دابـنێ، دەڵـێ: (عـەقڵی مرۆیـی لـە جـۆری ناسینەکانیدا ئەم قەدەرەی تایبەت بە خۆی هەیە: ئەوەیـە کـە بـە کۆمەڵـە پرسـیارێك ماندوو دەبێت و لە توانایشیدا نییە ڕەتیان بکاتەوە، چونکە بە سروشتی خودی عـەقڵ

---

١٢ كانت (ما التوجيه في التفكير؟) وەرگێڕانی: ل. و. بیك، هەروەها (فقد العقـل العلمـي وكتابـات أخـرى حول الفلسفة الأخلاقية عند كانت)، شیکاگۆ، ١٩٤٩، ل٣٠٤.

خۆی دەسەپێنرێن بەسەریدا، نایشتوانێ وەڵامیان بداتەوە، چونکە بە تەواوەتی بازدەدەن بەسەر توانای عەقڵی مرۆییدا و تێی دەپەڕێنن)[١٣].

## بناغەی بوونی (ئەنتۆلۆجی) عەقڵگەرایی لەقورئاندا

له پێش هاتنەڕووی وەرگێڕانی دەقەکانی فەلسەفەی ئەغریقی بۆ زمانی عەرەبی بە ماوەیەکی دووردرێژ، موسڵمانان وەها لە قورئان و لە فەرموودەدا باسکراوە ڕووبەڕووی چەمکی عەقڵ بوونەتەوە. ئەمەش تەواو جیاواز لەوەی کە لە سەردەمی نەفامیدا هەبووە، ئیسلام لە یەك کاتدا وێنای سەردەمی باوەڕ و زانست و عەقڵ و دادپەروەری و ئازادی دەکات، هاتنەنێو ئیسلام مانای ئەوەبوو واز لە داب و نەریتە عەقڵی و کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی نەفامی و بێباوەڕیی و ستەم و گەندەڵی بهێنرێ، مانای ئەوەبوو سیستمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی نوێ لەسەر عەقڵ و دادپەروەری و یەکسانی و چاکەکاری دابمەزرێ. هەروەها ئەوەی دەخواست بوونێکی نوێ بۆ عەقڵ بێتەڕوو تا سەربکەوێت بەسەر گوتاری بێباوەڕیی و بە سووك سەیرکردنی ڕەوشتیی. ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو مەگەر هەر لەو ڕێگایەوە بێ کە تێڕوانینێکی نوێ بۆ جیهان و شێوازێکی نوێ بۆ بیرکردنەوە پێشکەش بکرێ.

جا بۆ ئەوەی لە پایەی عەقڵ و عەقڵگەرایی لە قورئاندا و پاشتریش لە کەلەپووری هزری ئیسلامیدا تێبگەین، دەبێ بناغەی بوونی عەقڵ و جۆری بیرکردنەوە بدۆزینەوە و بیانخەینەڕوو کە قورئانی پیرۆز لە ڕێگای چیرۆك و ڕێنماییەکان و بەڵگەیەنەرەکان و پێوانەکردن و فەرمان و هۆشداریدان و شتە باشەکان و بەڵێن بە پاداشتی چاکەکاری و هەڕەشە بە سزادان دەیانخاتە پێش چاو. لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا شەبەنگێکی بەرفراوان و دەوڵەمەند هەیە کە پڕە لە بەڵگەیەنەرە لۆژیکی و ڕێنماییە ڕەوشتییەکان، ئامانجی ئەوەیە ویژدانمان بێدار و وریا بکاتەوە، تا بتوانین بەو جۆرە

---

[١٣]- کانت (نقد العقل المحض)، وەرگێڕانی: نورمان کیم سمیث، لندن، ١٩٣٣.

کـه شـایان بێـت بـه بـارودۆخی بوونمـان هەسـتین بـه بـەکارهێنانی هێـزه هەسـتی و عەقڵییەکانمان.

خوای گەوره له قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُـلِّ مَثَـلٍ لَّعَلَّهُـمْ يَتَـذَكَّرُونَ) (الزمـر: ٢٧). نموونـه لێـرەدا ئاماژەیـه بـۆ شـوبهاندن و چیرۆکەکان که له ڕێگەیانەوه پەیامه سـەرەکییەکان دەگەیـەنرێن — ئـەو پەیامانـه کـه ئەگەر نموونەیان لەسەر نەهێنرایەتەوه لەوانەبوو قـورس بـن و نەگەنـه زەیـنی مرۆیـی، بـەڵام مـادامێ چـیرۆکێ، یـان نموونەیـەك نییـه خـاڵی بێـت لـه دەقێکـی دەرکپێکـراوی مەعریفی، ئەوا ئەمه خۆی بانگهێشتکردنێکه بۆ ئاوڕدانەوه به لای عەقڵ و خەیاڵدا، تـا بەڵکو پەند وەربگرین و ئەوەی که زەرووری و سەرەکییه بێته زەینمان.

له ڕاستیدا ئەو شێوازێکی بیرکردنەوەیه که له قورئـانی پـیرۆزدا دەیبیـنین، نـه لـه کۆکردنـــەوەی ڕووداوەکـــان و نـــه لـــه ســـەرژمێرکردنی تونـــدی فـــەرمانپێکردن و قەدەغەکراوەکان پێکدێت، بـەڵکو پێکـدێت لـه پـەیمان و بـەڵێنێکی سـاغ و دروسـت و سوودگەیەنەر که دەخوازێ هەنگاو بۆ گەشتێکی هـزری و ڕەوشـتی و ڕۆحـی بنـرێ کـه تـــەواوی نـــاخ و جەســـته و کەســـایەتیمان دەگرێتـــەوه و زاڵ دەبێـــت بەســـەر کۆمـــەڵێ دوالیزمەدا وەك دوالیزمەی هەستیی بەرانبەر به عەقڵانی، ماددی بەرانبەر بـه ڕۆحـانی، تـاك بەرانبـەر بـه بوونـەوەر، سروشـتی بەرانبـەر بـه کلتـوور و.. تـا دوایـی، ئـەمجۆره بیرکردنەوه کامڵه که قورئان به شێوازی ناوازەی خۆی بەرجەستەی دەکات، سروشـتی ئەو واقیعه وێنا دەکات که بەشەکانی هەماهەنگ و هاوکـارن و فرەچینیـشه، هـەر ئـەم جۆری بیرکردنەوەیه هانمان دەدات لەسەر بینینی پەیوەنـدی ئـاڵوگۆڕپێکراو لـه نێـوان شتەکاندا و له زنجیرەیەکی فرەمەزنی بووندا که چۆن چۆنی شـتێك دەبێتـه هۆکـار بـۆ هاتنی شتێکی تر.

کەواته شێوازی قورئانی بۆ بیرکردنەوه هەر له بنەڕەتەوه شـێوازێکی وەسـفکاریی نەبووه، بەڵکو شێوازێکی ڕێنماییکاره. قورئانی پیرۆز هەڵنەساوه تەنها به وەسفکردنی شتەکان وەك ئەوەی که ڕووداو، یان کۆمەڵێ زانیاری بن، بـەڵکو مەبەسـت بـه چـیرۆکه

ئیلهامبەخـــشەکان و وێکـــچواندنە کاریگـــەرەکان و وەســـفە زینـــدووەکانی بـــۆ دروستکراوەکانی خوای گەورە و چۆنێتی بەڕێکردنی کارەکانی لە ڕێـڕەوی مێـژوودا بـۆ ئەوەیە تا ئەو شێوازەمان بگۆڕین کە شتەکانی پێدەبینین و پێگـە و پایـەی خۆیـشمان لەم جیهانەدا بزانین، قورئان دەیەوێ ویژدانی مرۆیی بە جـۆرێکی وەهـا بگـۆڕێ کـە لـە تواناماندا بێت لە ژیانێکدا بژین بونیاد نرابێ لەسەر باوەڕێکی سـاغ و دروسـت و پـاك و چاکەکاری.[١٤] کاتێکیش ئەم ویژدانە وریـا دەبێتـەوە و بـاڵغ دەبـێ بـە ئاسـتێکی وا کـە شـتەکان وەهـا لـە واقیعـدا هـەن بخاتـە نێـو گرنگیپێـدانی خۆیـەوە، ئـەوا ئـەوکات هەمووشـــتێك دەخرێتـــە جێگـــای خـــۆی: واتـــە عەقڵـــەکان و بیرکردنـــەوە و بەشـــە هەستپێکراوەکان و چاو و گوێی و دەرك و دادوەرییە ڕەوشتییەکانمان دەست دەکـەن بـە کۆبوونـەوە و یەکـدەگرن. جـا لـە دووتـوێی ئـەم میانـە بەرفراوانـەی بیرکردنـەوەی پێکەوەبوون و بەرچاوڕۆشنییە ڕەوشـتیەدا عـەقڵ و عەقڵگـەرایی هەڵدەسـتێ و گەشـە دەکات، لێرەوە عەقڵ لە نێو ئەو میانە فراوانترەی پێکهاتەی کەسایەتی و بوونمان لەم جیهانەدا و بۆ ئەو بەدەمەوەهاتنە مرۆییەمان کە بە واقیعی دەبەخـشین، ڕۆڵ و ئـەرکی خۆی جێبەجێ دەکات دوور لەوە خودی خۆی بنەما و بناغەیەك بێت بۆ حەقیقەت.

جا مادامێ عەقڵ دەدرێتە پاڵ شتێك لەوە فـراوانترە کـە مرۆیـی ڕووت بێـت، ئـەوا عەقڵ لە توانایدا نابێت خوای گەورە بناسێ واتـە (ئەمپـەڕ و ئەوپـەڕی بزانـێ و دەوری بدات)، چونکە بوونەوەری سنووردار و کۆت و بەندکراو ناتوانێ هەموو شتێك دەربارەی حەقیقەتی ڕەها بزانێـت. نـاتوانرێ بـە ئەزموونگـەری خـوای گـەورە بناسـرێ، چـونکە زانستی ئەزموونی دەخوازێ سنوورێك و شوێن و پەیوەندی و ڕێژەیی و شتانی تریـشی پێویستە، خوای گەورەش پاك و بێگەردە لە هەموو ئەمانە و جێبەجێ نابن بەسـەریدا، بەڵام خوای گەورە لە ڕێگای عەقڵ/ دەرکپێکردنەوە دەناسرێ هەتا ئەو سـنوورەی کـە لـە توانایدایـە دەرك بـە ڕەهـا بکـات، ئـەو ڕەهایـە کـە نابەسـترێتەوە بـە هـەڵهێنان و تێگەیشتن، هـەروەها بـە مەسـەلە و چـەمك و وێکـچواندنی وێنـەیی پـەی پێنـابرێ. لـە

[١٤]- فضل الرحمن (مواضيع القرآن الكبرى)، مينيا بوليس، بيليوشيكا إسلاميكا، ١٩٩٤، ص٢٢.

ڕاستیدا ئەگەر لەمە زیاتر چاوەڕێ لە عەقلْ بکرێ کە پێی هەستێ، ئەوە بەزاندن و تێپەڕاندنی سنووری دیاریکراویەتی. ئەویش وەك هەموو پێکهاتووەکانی تری واقیع وایە، مادامێ عەقلْ بەشێکە لە سیستەمی بوون و هەمووی هەبوون نییە، ئەوا هەرگیز لە توانایدا نییە بە تەواوی ئەمپەڕ و ئەوپەڕ و دەوری هەموو واقیع بدات، بە هیچ جۆرێکیش ئەم ڕاستییە بەکەمزانین و دابەزینی پلە و پایەی عەقلْ نییە، لە بەرانبەر ئەمەوە خوای گەورە ئەو ڕاستیە ڕەهایەیە، داهێنەر و دروستکاری هەموو شتێکە (وهو بكل شيء محيط). لە قورئانی پیرۆزدا دەخوێنینەوە کە (لَّا تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) (الأنعام: ١٠٣) واتە: (چاوەکان نایبینن، ئەو چاوان دەبینێ، زۆر وردبین و ئاگادارە)*.

هەر لەسەر بڕشتی خۆشەویستی و چاکە و چاکەکاری و دانایی و ڕۆحانیەت و هونەر، ئەوا عەقلْگەرایی وەڵامێکی ئەرێنی سەرەکی مرۆڤایەتییە بۆ بانگەشەی واقیع، بە عەقلْگەرایی توانامان دەشکێت بەسەر دۆزینەوە و خستنەڕووی بونیادی عەقلْگیریی سیستەمی بووندا، هەر عەقلْگەراییە کە داوامان لێدەکات زالْ ببین بەسەر بوونی هەستیماندا و لە پلەی یەکەمدا بە مانایەکی عەقلانی و ڕەوشتی پەیوەندی بکەین بە جیهانی سروشتەوە، هەروەها هەڵماندەنێ لەسەر جێگیرکردنی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی سیاسی کە لەسەر چاکەکاری و دادپەروەری و ئازادی دامەزرا بێت. قورئانی پیرۆز تێڕوانینی کەسێکی مرۆیی دەخاتە پێش چاو کە ئەو تێڕوانینە لە ڕێگای عەقلْگەراییەوە (عەقلْ و ئاخاوتن) مرۆڤایەتیمان پێکدەهێنێت، هەروەها ئەو سیفەتانەی تریش کە بە شێوەیەکی یەکسان و ناوەندی ئەو ئەرکەی پێمان سپێردراوە ئامادەی دەکەن بۆ ئەوەی بەدەمەوەهاتنێکی مانادار و بەکەڵك بە واقیع ببەخشێ، ئەمەش بە چەمکی هەبوون (ئەنتۆلۆجی) واتە دەرککردنی حەقیقەتی شتەکان و وەك خۆی لێی تێبگەین و بەو دیوە سەیری بکەین کە ئەمانەتێکی خواییە لامان.

---

* مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە و تەواوی ئایەتە پیرۆزەکانی تر کە لەم پەرتووکەدا هاتوون، لە کتێبی تەفسیری (تیشکێ لە قورئانی پیرۆز) لە نووسینی مامۆستا ئیبراهیم مەردۆخی وەرگیراون. (وەرگێڕ).

بەدەمــەوەهاتنی مــرۆڤ بــۆ بانگەشــەی خــوایی بــە پاراســتن و پارێزگــاریکردن لــە ئەمانەتەکەی ئەوەیە مرۆڤ ببێتـە جێنـشینی پـەروەردگار لـە زەویـدا و ملکەچـی بێـت، ئەمەش پڕاوپڕ مانای ئیسلام دەگەیەنێ، لـە زمـانی فـەرمیی ئاینیـشدا ئـەم ملکەچییە پێی دەوترێ پەرستش و (عبادة) بەرزترینی کاری مرۆییـە کـە سـنووری بـوونی مرۆیـی تێدەپەڕێنێ و دەمان بەستێت بە ڕەها و بە بێسنوورەوە.

هەر لەمبارەیەوە ئـەوا جـۆری تێڕامـان و سـەرنجدان و بیرکردنـەوەی قورئـانی بـە ئەزموونیی، یان عەقڵانیی، یان مێژوویی، یان میتۆدی، یان یەقینی، یان پـەروەردەیی، یان شـیکاری، یـان وەسـفکاری نـاژمێردرێ، هـیچ یـەك لەمانـە بـە تـەنها نییـە، بـەڵکو هەموویانن لە یەك کاتدا. ئـەو شـێوازە قورئانییـە شـیکاری چـەمکی لەگـەڵ دادوەریـی ڕەوشتیدا پێکەوە کۆدەکاتـەوە، سـەرنجی ئـەزموونی و ڕێنمـایی ڕۆحـی کۆدەکاتـەوە، سەرگوزەشـتەی مێـژوویی و ئاواتــەکانی ڕۆژی دوایـی پێکـەوە کۆدەکاتــەوە، دامـاڵین دەبەستێت بە فەرمانێکی فەرزەوە. قورئانی پیرۆز هەر لە بنەڕەتەوە هیدایەتـدەرە بـۆ خـەڵکی (سـورة البقـرة: ٢)، ئامـانجی ئەوەیـە لـە نەفامیـەوە بمانبـات بـۆ زانـست، لـە تاریکاییەوە بـۆ ڕوونـاکی، لـە سـتەم و دەسـتدرێژییەوە بـۆ ئـازادی. بەمـشێوەیە ئـەوا عەقڵگەرایی قورئانی لە ئەزموونی و چەمکییەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ڕەوشـتی و ڕۆحـی. هەروەها دەبێ عەقڵانی بێـت، واتـە هـەرجۆرە سـتەم و دەسـتدرێژییەك ڕەتبکاتـەوە و شەیدای بانگەوازی پەروەردگار بێت بۆ چەسپاندنی دادپەروەریی. پێغەمبـەری ئیـسلام (دروودی خـوای لێبێـت) وشـەی (الکـیس) پێناسـە دەکـات بـە: (ئـەو کەسـەیە کـە سەرزەنشتی خـۆی دەکـات و کاردەکـات بـۆ دوای مـردن) ترمیـزی ڕیوایـەتی کـردووە. (بەشی: القیامة: ٢٥). سەبارەت بە مرۆڤیش لە فیقھ و بیروباوەڕی ئیسلامدا ژیریـی بـە مەرج دەگیرێ تا ببێتە بەرپرس لە کارەکانی سەرشانی، چونکە ژیریی (عـەقڵ) نـەبێت ئەوا ئەرکیش بوونی نابێت (وتراوە ئەرك بە کەسی عاقڵ دەسپێردرێ — وەرگێڕ).

ئەمەش لە کەلەپووری ئیسلامیدا دەبێتە بناغەیەك بۆ بوونێکی ڕەوشتی بـۆ عـەقڵ و عەقڵگەرایی و پەیوەندییەکی بەهێز و بەتین لە نێوان زیرەکی و عەقڵگـەرایی و بـاوەڕ

و چاکەکاریدا دادەمەزرێنێ. (حارث المحاسبي) کە لە ساڵی/٨٥٧ مردووە، لە بارەی عەقڵەوە دەڵێ: (عەقڵ شتێکی خۆڕسکە و بە کردەوەکانیدا نەبێ ناناسرێتەوە)[١٥].

عەقڵ هەڵدەستێ بە ئەرکی پرەنسیپی کاری ڕەوشتی و تێدەکۆشێ تا وامان لێبکات نزیکتربین لە خوای گەورەوە. هەر بەپێی گوتە بەلگە ئامێزەکەی پێشەوا (حارث المحاسبي)، ئەگەر بە ڕاستی مرۆڤ عاقڵ بێت ئەوا هەوڵدەدات لە دنیا و قیامەتدا خۆی ڕزگار بکات. لەو پێناوەشدا دەبێ بە شێوەیەکی ساغ و ڕاست عەقڵی بەکاربهێنێ. ناوبراو لەو شیکارکردنەی کە لەسەر (شەرەفمەندیی عەقڵ) دایمەزراندووە و کردوویەتی بە ناونیشانی کتێبەکەی، ویستوویەتی نیشانە ناوازەکەی عەقڵی مرۆیی بخاتەڕوو تا باوەڕێکی ساغ و دروست و بەلگەدار و ژیانێکی چاکەخوازی پێ جێگیر بکات. هەر بەکارهێنانێکی ساغ و دروستی عەقڵ کە درەوشاوە بێت بە ڕووناکیی باوەڕ، سەردەکێشێ بۆ بیرکردنەوەیەکی عەقڵانی و ڕەفتاری ڕەوشتی. بەمشێوەیە ئەو باوەڕەی کە عەقڵ هەستێت بە ڕوونکردنەوە و سەلماندنی باوەڕێکی ڕیشەداکوتاو و جێگیر و یەقینییە و دوودڵی هەڵناگرێ. حەیدەر ئامولی کە فەیلەسوفێکە لە سەدەی چواردەهەمدا ژیاوە، وادەبینێ گونجاندن و تەبایی و هەماهەنگیەکی تەواو لە نێوان باوەڕ و عەقڵدا هەیە پەیوەندیی شەرع و عەقڵ وێکدەچوێنێ بە جەستە و ڕۆح. جا هەروەك چۆن ڕۆح بەبێ جەستە ناتوانێ ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، بە هەمان شێوە جەستەش بەبێ ڕۆح لە توانایدا نییە مانایەك، یان ژیانێ، یان کاملێی بەدی بهێنێ. لەبەرئەوە (نابێ شەرع بێنیاز بێت لە عەقڵ. عەقڵیش نابێ بێنیاز بێت لە شەرع)، حەیدەر ئامولی ئاماژەی بە گوتەیەك داوە و دەیگێڕێتەوە بۆ ڕاغیبی ئەسفەهانی کە گوتەیەکی ڕۆشن و بەرچاوە و جێگای تێڕامانە، دەڵێ: (بە شەرع نەبێت عەقڵ ڕێگای ڕاست ناپێکێ، بە عەقڵیش نەبێت شەرع ڕوون نابێتەوە و دەرناکەوێ)[١٦]، کەواتە لۆژیك و هەواڵی ئاسمان

---

[١٥]- حارث أسد المحاسبي (شرف العقل وماهيته)، م. أ. عطا، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٨٢، ص١٩.

[١٦]- حيدر آملی (جامع الآسرار ومنبع الأنوار)، هنري كورين و عثمان يحيى، طهران، قسم الدراسات الايرانية في معهد البحوث الفرنسية الإيرانية، ١٩٦٨، ص٣٧٢ – ٣٧٣.

یەکدەگرن و هەماهەنگن تا هەر نارۆشنی و لێڵییەك کە لە سروشتی شتەکاندا هەیە، نەیهێڵن و تا پەی ببەین بە مرۆڤایەتیمان، بەڵام هەتا عەقڵی مرۆیی نەبینین کە لە میانەیەکی بیرکردنەوە و تێڕامانێکی فراوانتردا کاربکات، زەحمەتە ئەوە دەستەبەر ببێ.

## عەقڵ و بیرکردنەوە لە میانەدا

کرداری عەقڵی بەکارهێنا، یان بیریکردەوە، یان پڕاوپڕ عەقڵی خۆی بەکارهێنا، واتە گرتی و پاراستی و پاسەوانی کرد، بەمجۆرە بە عەقڵ خۆمان لە خڵتە و خراپە و لە هەڵە و تاوان دەپارێزین، بۆیە کاتێ وشەی (معقل) دەبینین ماناکەی (حصین)ە واتە بە قایمی پاراستی. ئەمەش هەمان ئەو مانایەیە کە دەستەواژەی (کەسی عاقڵ) هەڵیدەگرێ. نابێ بەکەم سەیری ئەم مانا سەرەکیەی عەقڵ بکرێ، چونکە پێکهاتەی سەرەکی بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان لە ژێریدایە بەو پێیە کە وەڵامدەرەوەی راست و دروستی مرۆڤایەتییە بۆ بانگەوازی هەقیقەت، جا بە پێچەوانەی ئەو هەوڵانەی کە دەدرێن بۆ دابڕینی عەقڵ و عەقڵگەرایی و کردنی بە بالای لێهاتوویی لۆژیکی و بەڵگەگەیەنەری جێبەجێکاردا، ئەوا بەو پێودانگە کە عەقڵ بنەمایەکە بۆ راستی و ئامرازێکە بۆ مەعریفە ئەوا لەگەڵ واقیعی شتەکان بەیەك دەگات، چونکە پرۆسەی بیرکردنەوە بریتی نییە بە تەنها ژماردنی تایبەتمەندییە فیزیکییەکانی شتەکان، یان کۆمەڵە پەیوەندییەکی لۆژیکی بۆ چەمکەکان. بیرکردنەوە گەورەترە لە وێنەگرتنێکی زەینی رووت بۆ شتەکان، چونکە بە تەنها زەینی رووت هەروەك فەیلەسوفە موسڵمانەکان جەختی لەسەر دەکەن، جگە لە وێنەیەکی واقیع شتێکی ترمان پێنابەخشێ، ئەو وێنەیەش وەك هەموو مەسەلە زەینییە رووتەکانی تر وەهایە، وێنەیەکە بێگیان و بێجوڵەیە و بە هیچ جۆر لە توانایدا نییە یەکسان بێت بە خودی واقیع.

راسـتە چـەمکە داماڵراوەکـان (مجـرّد) پێویـستن بـۆ بیرکردنـەوەی عـەقڵانی و دروستکردنی هزرەکان، بەڵام پرۆسەی بیرکردنـەوە زۆرتـر و زیـاتر لـە تـەنها دامـاڵین و بەکارهێنانی چەمکەکان دەخوازێ. پرۆسەی بیرکردنەوە لە میانەی دەرگیربوون لەگەڵ واقیعـدا روودەدات و دەمانخاتـە نێـو پەیوەندییەکـەوە لەگـەڵ شـتێکدا کـە لـە ئێمـە گـەورەترە. ئەمـەش مانـای وایـە سـەیرکردن و چـاودێریکردن و گـوێگرتن و بیـستن و بیرکردنەوە و تێڕامان بخرێتەگەڕ، پاشتریش گەیشتن بـە دەستخـستنی دەرئـەنجامێکی پراکتیکـی و رەوشــتی گونجـاو، واتــە بەدەمەوەچـوونی ئەوشــتە کــە لــە واقیعــدا رووبـەڕوومان دەبێتـەوە. ئـەم بیرکردنەوەیـە شـیکارکردنێکی عەقڵانییـە لـە هـەمان کاتیشدا پابەندبوونێکی رەوشتییە. بیرکردنەوە بـە مانـا هـەرە قووڵەکـەی ئەوەیـە کـە دەبێتە رێگر و ناهێڵێ وەها سەیری شتەکان بکەین هۆکار بن بۆ مەبەست. بیرکردنـەوە بە کۆمەڵە بناغـە و بنەمایـەکی بـوونی و رۆحیـی هاوتـا بەیـەك و بـە دەنگێکـی زوڵاڵ و هەژموونـدار دەچێتەوە بەگـژ عەقڵگـەرایی ئامێریـدا. هـەروەك لەمـەوپاش دێمـە سـەر مشتومڕکردن لەسەری، مادامێ ئەم جیهانە خوای گەورە دروسـتیکردووە، ئـەوا نـاکرێ ئەو جیهانـە داڕنـرێ و بـە تـەنها لـە سـوودمەندیدا کورتبکرێتـەوە، بـەڵکو ئـەو جیهانـە مانایەك و بەهایەکی بابەتییانەی هەیە کە سەربەخۆیە لە ئێمە.

هەر لە سەرەتاوە، هیچ نەنگیەك لەو بیرۆکەیەدا نییە کە ئێمـە بـە شـوێنکەوتنمان بۆ کۆمـەڵێ پرەنـسیپ و هەڵسوکەوت ئاسـتێك لـە عەقڵگـەراییمان دەسـتەبەرکردووە، چـونکە گومـانی تێدانییـە کـە شـوێنکەوتنی یاسـا لەباریدایـە بـە کـارێکی عـەقڵانی هەژماربکرێ و لە ژیانی رۆژانەمان و دۆزینەوە زانستییەکان و لە بڕیـاری ئـابووری و لـە ژیانی سیاسـیماندا و لـەهی تریـشدا سـوودێکی گونجـاوی هـەبێت، جـا لـە کاتێکـدا کـە عەقڵگەرایی ئامێریی بەکارهێنانی خۆی هەیە، بەڵام لەسەر رووبەری خودگەریی مرۆیـی جووڵــە دەکــات و مــەرج نییــە بمانبەســتێتەوە بــە هەقیقەتــەوە و مــەرجیش نییــە شوێنکەوتنی پرەنسیپێك ببێتە هـۆی دەستخـستنی دەرئـەنجامێکی عـەقڵانی، دەکـرێ هەڵسوکەوتێ بگرینەبەر و بگەینە کۆمەڵێ دەرئەنجامی دیاریکراو، بەڵام وێڕای ئـەوەش

لەوانەیـە ئـەو دەرئەنجامـە زۆر دووربێـت لـە عەقڵگەراییـەوە، دووریـش نییـە ببێتـە کارەسـات. لەسـەر رەویـەی سیـستمە سـتەمکار و ملـهوڕە زۆرەکـان ئـەوا بـۆ نموونـە (نازیزم) لە ژێر حوکمی عەقڵانیدا یاسایەکی سەپێنراو و زۆرەملێی هەبوو کـە لـە رووی جێبەجێکردنـەوە حـوکمی ئـەڵمانیای پێـدەکرد. بـەو عەقڵگەراییـە ئامێریـەیان هـاتن دەستیان خستە نێو ئایین و مێژوو و سیاسەت و سەرئەنجام مانای مرۆڤایەتی مرۆڤیان لـە ناخـەوە وێرانکـرد. کـەوابوو دەبـێ هـەموو ئـەوەی کـە پێـی هەڵدەسـتین و بـە مەبەستەکەشیەوە ئەوە بێت کە بناغەیەکی عەقڵانی هەبێت.

بۆچوونی قورئانی پیرۆز هاوڕایە لەگەڵ تێڕوانینێکـی بابەتیانـەی عەقڵگەراییـدا کـە جـەخت لـەوە دەکاتـەوە بـە تـەنها ئـامراز و هەڵـسوکەوتەکانمان نـین کـە دەبـێ بـە شێوەیەکی راست و دروست عەقڵانی بن و پڕاوپڕ بن لەگـەڵ واقیعـی شـتەکاندا، بـەڵکو دەبـێ بۆچـوونەکان و چـەمکە سەرەکییەکانیـشمان هـەروابن، تێـڕوانینی بابەتیانـە بـۆ عەقڵگەراییش لە کرۆکی عەقڵگیری بوونەوە دێت، کە دروستکراوی خوایـە، هـەرکارێکی عەقڵانیش کە ئێمە ئەنجامی دەدەین کـارێکی گونجـاوە لەگـەڵ پرەنـسیپی عەقڵدا کـە ئەویش دەچێتە نێو سروشتی شتەکانەوە، هـەرکارێکی تـر پێـچەوانەی ئـەم پرەنـسیپە بکرێ، ئەوە دامان دەبەزێنێ بۆ نێو ڕیزی ناعەقڵانی.

ئـەوەی راسـتی بێـت خـودی ئەنـسرۆپۆلۆجیای –(زانـستی کۆمەڵـە بوونـەوەرێکی خاوەن عەقڵ)– عـەقڵ پـشتگیری لـە عەقڵگـەرایی بابـەتی دەکـات، زۆربـەی بیرمەنـدە موسـڵمانەکان وادەبیـنن کـە عـەقڵ بـە تایبەتمەندییـە سروشـتییەکانی خـۆی دەچـێت بەدەم دەرخستە ئەزموونی و چەمکییە ڕووتەکانـەوە. بـەدەر لـەوەش کـە بـە گریمانـە عــەقڵ بــە لاپەڕەیــەکی ســپی دانرابــێ، ئــەوا هــەر ڕەنگدانەوەیەکــە بــۆ نیــشانە سەرەکییەکانی بوون. راغیبی ئەسفەهانی عەقڵ دابەش دەکات بۆ دوو عـەقڵ: (عـەقڵی چاپکراو، عـەقڵی بیـستراو)، عـەقڵی بیـستراو ئامـاژە بـەو شـتانە دەکـات کـە مـرۆڤ لـە کەسانی ترەوە دەیان بیستێ، لەوەوە نزیکە کە یەکبگرێ لەگەڵ ئەزموندا و ئاماژەیـە بـۆ میانــەی پەیوەندییــە مرۆییــەکان، بــەڵام عــەقڵی چــاپکراو ئامــاژە بــە توانــایی

دروستکراوی سروشتی بۆ تێگەیشتن لە سیستمی عەقڵی بیستراو دەکات بە هۆی گوێگرتنمان لە کەسانی تر فێر دەبین، ئەمەش ئاماژەیە بۆ میانەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو دەقە زمانەوانیانە کە شتەکانیان پێ ناو دەنێین.

هەردوو عەقڵەکەش ئاڵێنراون بە یەکەوە و هاوکاری یەکترن، بەڵام (عەقڵی چاپکراو) لە (عەقڵی بیستراو) لە پێشتر و دێرینترە. راغیبی ئەسفەهانی ئەم دابەشکردنە دەداتە پاڵ پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕ.خ) کە وتوویەتی: (عەقڵ دوو عەقڵە، عەقڵێکی چاپکراو و عەقڵێکی بیستراو، ئەگەر عەقڵی چاپکراو نەبێ ئەوا عەقڵی بیستراو سوودی نییە، هەروەك چۆن ئەگەر ڕووناکی چاو نەبێ ئەوا ڕووناکی خۆریش سوودی نابێت)[١٧]، کەوابوو عەقڵ بە دوو ڕێگا کاردەکات: بەجۆرە چاپکراوەکەی کە لە ناوەوە و لە دەرەوە کاردەکات، هەروەها بە تایبەتمەندییە سروشتییە خۆڕسکەکانی خۆی ڕووبەڕووی جیهانی بینراو دەبێتەوە و دەیبینێ، چاپکراو بەشێکە لەو سروشتە خۆڕسکە کە پەنجەرەی بینینمانە بۆ جیهانی هەبوون، لەبەر ئەوە دەبێ بیپارێزین بۆ ئەوە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ببینین،[١٨] هەروەها بەجۆرە بیستراوەکەی لە دەرەوە بۆ ناوەوە دەجوڵێ و کاردەکات و هەموو بەشە دەرخستە ئەزموونییەکان و سەرنجدانەکان لە جیهانی دەرەکیدا لەخۆ دەگرێ و لێیان تێدەگات. ئەو کۆکردنەوەیەش لە نێوان هەردووکیاندا واتە ناوخۆیی و دەرەکی لەوەدا کە پەیوەندی بە واقیعەوە هەیە، وێنەیەکی تەواوتری ئەرکی عەقڵمان پێدەبەخشێ،

---

[١٧]- الراغب الأصفهاني (المفردات في غريب القرآن)، أسنتبوا، کهرمان یاینیلاری، ١٩٨٦، ص١١. حارس موحاسیبی و ئەبو حامیدی غەزالی باسیان لەم پێناسە دووەمەی عەقڵ کردووە. حارس موحاسیبی: شرف العقل وماهيته، ل٢٠.

[١٨]- فارابی ئەمەی دیاریکردووە بەوپێیە کە یەکێکە لە شەش ماناکەی عەقڵ، بڕوانە: الفارابي (رسالة في العقل)، موريس بوريج، بيروت- لبنان، دار المشرق ١٩٨٣، ص٨ – ٩.

بەڵام مەعلومە کە ئەم ئەرکە سەرەکییەی عەقڵ بەردەوام لە نێو میانەیـەکی فـراوانتری دەلالەتی بوون و (ئەنتۆپۆلۆجی) لێهاتوویی و مەعریفیدا ڕوودەدات.[19]

گومانی تێدا نییە کـە گـرنگترین و سـەرەکیترین ئـەرکی عـەقڵ/ هـزر ئەوەیـە وەك ئاوێنەیەك کاربکات و مانایەکی کرۆکیـی و سیـستمی بـۆ شـتەکان نیـشان بـدات. کـاتێ عەقڵیش هەڵدەستێ بەم ئەرکە ئەوا پەیوەندییەکی تایبەتی بە هەقیقەتە خواییەکانەوە دەبێت، چونکە لەو سیفەتە خواییانەوە پرشنگی خۆی دەهاوێـژێ. هـەموو ئـەوەی کـە عەقڵ لە سیستم و لە زەروورەت و عەقڵگیری لە بوونەوەردا دەیخاتەڕوو، دیمەنێکە لـە سیفەتەکانی خوای گـەورە و لـە ئـیرادەی بێـسنووری خـوای گـەورە. مـەلا صـەدرایش وەسـفێکی درەوشـاوە بـۆ ئـەم لایەنـەی عـەقڵ دەخاتـە پـێش چـاو و دەڵـێ: (هـیچ پەردەیەك لە نێوان عەقڵ و خوای گەورەدا نییە، عەقڵیش بۆی هەیـە بـە خـودی خـۆی خـودی یەکـەم کـە (الله)یـە بدۆزێتـەوە و ببیـنێ. هـیچ هـۆ و ناوەنـد و پەردەیـەك لـە نێوانیاندا نییە... بە دڵنیاییەوە کـە پـەروەردگار بـە خـودی دەرکـەوتنی ڕۆشـن خـۆی دەدات بە سـەریدا، هـیچ لایـەنێکی تـر، یـان سـیفەتێکی زیـادە نایەتـە ئـەو نێوبەینـە. پەروەردگار بە خودی خۆی خۆی دەردەخات بەسـەر عـەقڵی یەکەمـدا. خـودی عـەقڵی یەکـەمیش بریتیـە لـە وێنـەی ئـەو دەرکەوتنـە ڕۆشـن و روونـەی پـەروەردگار، خـودی عەقڵیش وەك دیوی ئاوێنەیەك وایە کە وێنەی یەکەمی تێدا دەبینێت، جا هەروەك چۆن دیوی ئاوێنەکە جگە لە وێنە بینراوەکە شتێکی تری تێـدا نییـە و ئـەو وێنـە بینـراوەش شتێك نییە پێچەوانەی هەقیقەت بێت، هەر بەمشێوەیە ئەوا عـەقڵیش جگـە لـە وێنـەی یەکەمین ناسـنامە ناسـنامەیەکی تـری نییـە، چـونکە جگـە لـە خـودی ئـەو ناسـنامەیە ناسنامەیەکی تری نییە شایانی پرشنگدان و دەرکەوتن بێت...

---

[19]- هربرت أ. دیفیدسون (الفارابي و إبن سینا و إبن رشد حول العقل)، تێڕوانینیان بـۆ زانـستی بوونـەوەر و تیۆرەکانیان لەسەر عـەقڵی کارا لە عـەقڵی مرۆییدا، نیویـۆرك، ئۆکـسفۆرد، چـاپخانەی زانکـۆی ئۆکـسفۆرد، ١٩٩٢.

لەم باسەدا دوو هێز و دەستەڵات، واتــە خـودی عـەقڵ و پرشـنگدان و دەرکـەوتنی پەروەردگار لێیەوە بوونیان نییە، چونکە لە خـوای گـەورەوە دووره یـەك شـت بـە دوو وێنە بە یەك ئاڕاستەدا، واتە وێنەی عەقڵ و وێنەی دەرکـەوتن، بنێـرێ، مەحاڵیـشە کـە دوو بوون بۆ یەك شت لە یەك کاتدا دووبارە ببێتەوە، هەر ئەمەشە کە زانا خواناسەکان وتوویانە خوای گەورە پرشنگی دەرکەوتنی خۆی دووجار لـە یـەك کاتـدا لـە وێنەیەکـدا دەرناخات، لەمەوە ئەوە سەلمێنراوە کـە بـوونی خـودی عـەقڵ بریتیـە لـە دەرکـەوتنی پەروەردگار بە وێنەی خودی پەروەردگار بەسەریدا، وێنەی خـودی پـەروەردگار شـتێك نییە پێچەوانەی زاتی خوا بێت)[٢٠].

## وشەو زاراوەکانی بیرکردنەوە لەقورئانی پیرۆزدا

قورئانی پیرۆز ژمارەیەك وشە و زاراوە کە پەیوەندییەکی پتەویان بە عەقڵ/ هزر و بیرکردنــەوەوە هەیــە، بــەکاردەهێنێ، لەوانــە بیرکردنــەوە و دڵ و ناوسـنگ، هەریـەك لەمانەش گونجاوە لەگەڵ ڕوویەك لە ڕووەکانی دەرکپێکردن و بیرکردنەوە و سەرنجدان و تێڕامان. هەر لە قورئاندا چـەندین وشـە و زاراوەی تـر هـەن کـە دەچـنە ژێـر هـەمان بەشی ماناگەیەنەری عەقڵەوە: وەك زانست، تێگەیشتن، فیقـه، دەرکپێکـردن، هەسـت، سـەلماندن، بەڵگـە و دەسـتەڵات، جیاکـەرەوە و تێڕامـان، گـۆکردن، حـوکم، دانـایی و زیکر. قورئانی پیرۆزیش ئەم وشانە بەکاردەهێنێ کە ئەگەر بە تەواوی ڕاڤەیان بکـەین، ئـەوا پێویـستیان بـە لێکۆڵینەوەیـەکی جیـا و سـەربەخۆ هەیـە، کـە میانەیـەك لـە بیرکردنـەوەی تـەواو دادەمـەزرێنێ و تیایـدا دەرگیربوونمـان لەگـەڵ واقیـع لـە دیمەنـە جۆراوجۆرەکانی هەقیقەتی گشتی و گشتگیر بۆ بوون دەخاتەڕوو. لەمەش گـرنگتر ئـەو میانەیە دەمانبات بۆ جۆرێك لە بیرکردنەوە کە سەرنجی ئەزموونی و شیکاریی عەقڵی و دادوەری ڕەوشتی و پاککردنەوەی ڕۆحی لە خۆیدا کۆدەکاتەوە.

[٢٠]- مەلا صەدرا (رسالة الحشر)، لێکۆڵینەوەی موحەممەد خواجەوی لەگـەڵ وەرگێڕانـە فارسـییەکەدا، تـاران، إنتشارات مولوي، ١٩٩٨، ل٨٥-٨٦.

هەروەها ئـەم وشـە و زاراوە دەوڵەمەندانـە ئامـاژە بـە گـشتگیریی دەرکپێکـردن و بیرکردنـەوە دەدەن، جـا بـە پێـچەوانەی ئـەو جیاوازییـە جیاکەرەوانـە کـە لـە نێـوان دەرکپێکردنــی هەســتی و بیرکردنــەوەی چــەمکیدا هەیــە، ئــەوا ڕووبەڕووبوونــەوەی سروشـتیمان یـان خـودی (پلـەی یەکـەم) بـۆ شـتەکان بـەو پێیـە کـە ئـەزموونێکی یەکبوونییە هەر ڕوودەدات، لە دەرکپێکردنی شتەکاندا بەشـەکانی هەست و عـەقڵ لـە یـەك کاتـدا ئیـشی خۆیـان دەکـەن. ئـەو جیاوازییـە تیـژەی لـە نێـوان ئـەو سـیفەتە هەستیانەدا کە هەماهەنگ دەبن لەگەڵ جیهانی فیزیکـی مـاددی و نێـوان ئـەو چـەمکە هزرییانەدا کە گونجـاون لەگـەڵ جیهـانی هـزردا هەیـە، بـریتین لـە کۆمەڵـە سـەرنجێکی جیاکاریی دیکارت لە نێوان ماددەی کشاو و کەسایەتی بیرمەنددا، ئەمـەش لـە توانایـدا نییـە وەسـفێکی ورد و پڕاوپڕمـان بـۆ پرۆسـەی پراکتیکـی دەرکپێکـردن و تێگەیـشتن پێبدات. ئەم پۆلێنکردنانەش لە واقیعدا دەچنەوە سەر تێڕامان لە (پلـەی دووەم)، کـە جیاکاری لە نێوان خود و بابەتدا و زانا و زانراو و دەرکپێکەر و دەرکپێکـراو و زەیـنی و ماددی و.... تـا دواییـدا دەکـات، لـە ڕاسـتیدا ڕووبەڕووبوونـەوەمان بـۆ خـودی (پلـەی یەکەم) لە میانەیەکی جیاوازدا ڕوودەدات، کۆی ئەزموونی مەعریفیمان بـۆ شـتەکان لـە کۆی بوونەوە سەرچاوە دەگرێ و دروست دەبێـت، مەعریفـەش وەك ڕووبەڕووبوونـەوە وایـە، واتــە ئێمــە لــە بــەردەم بابــەتی زانـستدا وەسـتاوین، ئــەویش دەمانخاتــە نێـو پەیوەندییــەکی تایبــەت لەگــەڵ هەقیقــەتی شــتەکان و لــە ڕێگــای خوداپێــداوە مەعریفییەکانمانەوە دەچین بە دەمیەوە نەك لە ڕێگای مەرجەعیـەتی خودییـەوە بـێین مانای بۆ بتاشین. ئەم مانای شارەزابوونە بە عەقڵ یەکێك لە مانا ڕیشکییەکانی وشـەی (عەقڵ) کە (بەستیەوە)یە دەخاتەڕوو، عەقڵ دەمانبەستێتەوە بە هەقەوە و پاشان لـە سـەرووی زنجـیرە هۆکـارە ناسـراوەکانەوە ئاسـۆیەکی نوێمـان بـۆ دەکاتـەوە. عـەقڵی مرۆیی بە ئاڕاستەیەکی ئاسۆییدا لە نێوان ڕووداوەکان و نێوان چـەمکەکاندا دەجـوڵێ و دێت و دەچێ و پاشتر هەردووکیان دەبەستێت بەیەکەوە. بە ئاڕاسـتەیەکی سـتوونیش خوارووەکەیان دەبەستێت بە سەرووەکەوە، قورئانی پیرۆزیش بەیەکگەیشتنی هـەردوو

ئاڕاسته هۆكارییەكە پشتڕاست دەكاتەوە: واتە ئاسۆیی كە جیهانی هۆكـارە فیزیكـی و ستوونییەكە كە فەرمانی خوایی پێشكەش بە جیهـانی سروشـتی دەكـات، ڕێكـدەخات. هیچ ناكۆكییەكیش لە نێوان هەردووكیاندا نییە، بەڵكو هەر ئەوەندەیە كـە هەریەكـەیان ڕێسای جیاواز بە خۆی پەیڕەو دەكات. ڕۆژ و شەو بە دوای یەكدا دێن وەك بەشێك لەو سیستەمە سروشتییە كە تیایدا دەژین، هیچ كەموكوڕییەكیش لەم یاسایەدا نییە، خـوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ) (یس: ٨٢). واتـە: ئەگەر خوای گەورە بیـەوێت كارێـك ئـەنجام بـدات ئـەوا پێـی دەفـەرموێ ببـە، ئـەویش ڕاسـتەوخۆ دەبێـت. كەواتــە هــەموو جیهانێــك لــە بــوون پێویـستی بــە جــۆرێ لــە بیركردنەوەی جیاواز هەیە.

سروشتی خودی واقیع چەندین وشەی وردی تایبەت بە تێگەیشتن و عـەقڵپێبردن و بیركردنەوەی سەپاندووە كە قورئانی پیرۆز بەكاریان دەهـێنێ، چـونكە دەرككـردن بـە واقیعێكی فرەچین و فرەڕەهەند بەیەك جۆر میتۆدی مەعریفی هەروا ئاسـان نییـە و لـە تواناوادا نییە، ئەو پرۆسەیە دەخـوازێ كۆمـەڵێ گـەورەتر لـە ئـامڕازی تایبـەت بـە توانـا تێگەیشتنەكان بەكاربهێنرێ. هەر لەمبارەیەوە قورئانی پیرۆز باس لە (جیهانی غـەیب) و لە (جیهانی بینراو) دەكات، جیهانی نادیار (غیب) ئاماژە دەدات بـەو جیهـانی بوونـە كە جگە لە پەروەردگار كەسی تر نایزانێ، ڕاستە خـوای گـەورە بەشـێك لـەو جیهانـەی خستووەتە پێش چاو، بەڵام شارەزابوونی تەواو و گشتگیر پێی ئەوا جگە لە خوا خۆی بــۆ كەســی تــر ئاســان و كــراوە نییــە، جیهــانی نادیــار ڕێنماییمــان دەكــات بــۆ ڕووبەڕووبوونەوەمان بە جیهانی بینـراو و پاشـتریش ئـەركی ڕێنیـشاندەر و ڕێنماییكـار دەبینێ بۆ شیكاریەكانی دادوەرییە ڕەوشتییەكانمان، دواتریش بە مانایەكی پـشتەوەی شتەكان (ماورائي) و ڕەوشتی هەڵدەستێت بـە ڕێكخـستنی كاروبـاری ئـەو جیهانـە كـە تیایدا دەژین. دەربارەی تێگەیشتنی قورئان بۆ جیهانی بینـراو جێگـای ئاوڕلێدانەوەیـە كە بۆچوونی ڕاست و دروست بۆی پشت دەبەسـتێ بـەو ئەزموونـە كـە خراوەتـە پـێش چاو، ئەمەش جیاوازە لە سەیركردن و بینین، چونكە خستنە پێش چـاو واتـە وەسـتان

لە بەردەم ئەو شتەدا کە خۆی پێشکەشی دەکات و خۆی دەخاتە بەرچاو، هەروەها بە تەنیشت سەیرکردن و بینینەوە دەخوازێ ئامادە بێت، ئەمەش دەشوبهێنرێ بە ئەزموونی سەیرکردنی دیمەنێکی سروشتی و وەرگرتنی بۆچوونێکی ڕواڵەتی لێی. کاتی سەرنجدانیش لە دیمەنێکی سروشتی ئەوا لە نێوان بەشەکان و هەموویدا دێین و دەچین و لە هەر جارێکیشدا پەیوەندییەکی نوێ لە نێوانیاندا دەدۆزینەوە.

بەم واتایەش ئەوا ڕووبەڕووبوونەوەمان لەگەڵ واقیعی شتەکاندا بە ڕێڕەوێکی دەرئەنجامداری عەقڵانی و تێگەیەنراو دادەنرێ، بەڵام ئەم پرۆسەیە لە نێو میانەیەکی فراوانتری عەقڵگیری و مانادا ڕوودەدات کە بیرکردنەوەی لۆژیکی و گوتاریی ڕووت تێدەپەڕێنێ. ئەو چەمکانەش لە بۆشاییدا دروست نەبوون و لەگەڵ دیمەنە جۆراوجۆرەکانی واقیعدا پێکدێن و هەماهەنگ دەبن و لە ڕووبەڕووبوونەوەمان بۆ ئەو واقیعە پەیدا دەبن و گەشە دەکەن و قورئان وەسفی دەکات بە (بینەر و شایەتدەر بە هەق). ئێمە ڕووناکی (دەبینین)، (دەست دەدەین) لە تەختە، (بۆنی) گوڵ دەکەین، (تامی) گێلاس دەکەین، (دەرك) بە دووری دەکەین، (بیر) لە ناکۆتایی دەکەینەوە، (هەست) بەبوونی ئاو دەکەین، (جیاوازی دەکەین) لە نێوان شتێك و سێبەرەکەیدا، (تێدەگەین) لە فەرمان، (دەچین بەدەم) بانگەوازەوە، (ملکەچی) هەق و ڕاستی دەبین، بەڵگەمان (لاپەسەندە)، (سەرنج دەدەینە) ماناکانی ژیان و.... تا دوایی. هەریەکیش لەم کردارە مەعریفیانە شتێك لەبارەی توانا زەینی و تێگەیشتنەکانمانەوە دەڵێ کە بە هۆیانەوە لە جیهان دەگەین. بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە گونجاوە لەگەڵ شتی دەرەوەماندا و ئاسۆی خودیمان فراوانتر دەکات.

## عەقڵ و دڵ و ویژدانی مرۆیی

ئەمە هاوشێوەی دیمەنێکی سروشتی کاریگەرە کە وەك ئەزموونی یەکبوونیی واقیع و لەجیاتی چوارچێوەیەکی دیاریکراو خۆی نیشاندەدات و لێیەوە لێکۆڵینەوە و شیکارکردنەکەیی وەردەگیرێ. قورئانی پیرۆز دڵی دیاریکردووە کە شوێنەگەیەکی

ڕاستە بۆ ئەزموونی یەکبوونیی واقیع، دڵ ئەو جێگایەیە کە تەجروبەی دەرکپێکراو و بیرکردنەوەی چەمکگەری و دادوەریی ڕەوشتی تیایدا تێکەڵ بە یەك دەبن و یەك دەگرن. هەر لە سەردەمی وەرچەرخانی دیکارتی بە دیوی سۆزدارییی (دڵ)دا لە فەلسەفەی خۆرئاوادا، ئەوا شایانی باسە کە قورئانی پیرۆز بە شێوەیەکی زۆر ڕوون ئەرکی مەعریفی و هزری دڵ دیاری دەکات. ئەو ئایەتە پیرۆزانەی باسی دڵ دەکەن ئاماژە دەدەن بۆ ئەو ویژدانە قووڵەمان کە بە هۆیەوە بە تەواوەتی واقیعی پێ دەبینین.

قورئان بیرکردنەوەی عەقڵانی و دادوەریی ڕەوشتی ئاوێتە بەیەك دەکات، هەرکات دڵ پاك بێت و لەسەر هیدایەتی ڕاست و دروست بێت، ئەوا دەبێتە پێشڕەو و سەرۆك بەسەر هێزە مەعریفییەکانی ترەوە و ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕووناك دەکاتەوە، ئەوکات دڵ و عەقڵ ئەرکی کەناڵێك دەبینن بۆ بینینی حەقیقەتی شتەکان بە جۆرێکی وا کە دەبێ خۆمان ببەستین پێیەوە، هەر لەسەر ئەم میانەیە زمانناسە عەرەبەکان عەقڵ و دڵ وەك دوو وشەی هاوتا و هاومانا بەیەك دیاری دەکەن[21]. لە ڕاستیدا مەبەست لە بیرکردنەوە بە عەقڵ و بە دڵ بۆ دۆزینەوە و خستنەڕووی سیستمی عەقڵگیرییە و بۆ نیشتەجێبوونە تیایدا، چونکە کۆمەڵێ بوونەوەری دیاریکراو لە بوونەوەردا مانای خۆیان لەوەوە وەردەگرن. بیرمەندە موسڵمانەکانیش هیچ جۆرە دژایەتییەك لە نێوان عەقڵ و دڵدا نابینن، یان لە نێوان بیرکردنەوەی عەقڵانی و سەرنجدان و تێڕاماندا، یان لە نێوان لۆژیك و هەواڵی ئاسمانیدا. ئەبو حەییانی تەوحیدی کە یەکێکە لە گەورە زانایانی زانستی عەقیدەناسی، لە کتێبە ناودارەکەیدا بە ناوی (المقابسات) بە پاڕانەوە لە خوای گەورە دەستپێدەکات و دەڵێ: (ئەی خوای گەورە بە بەخشندەیی و بە گەورە و شکۆمەندیی خۆت لێت دەپاڕێمەوە بە ڕووناکی عەقڵ ڕۆحی (زیندوویی) دڵم پێببەخشیت).

---

[21] إبن منظور، لسان العرب، هەردوو عەقڵ و دڵ، بەیروت، بێبەروار، بەرگی یەکەم، ل٦٨٧، هەروەها بەرگی١١، ل٤٥٨-٤٥٩.

جا ئەگەر لە پرۆسەی چوونەناوی ئەزموونی و چەمکی شتەکان تێبگەین کە چۆن چۆنی کاردەکات، ئەوا جێگای سەرسوڕمان نییە. هیچ گرەنتیەکیش نییە چارەسەرکردنی پارچەکانی هەست بە شێوەیەکی راست و دروست سەربکێشێ بۆ پەیبردن بە شتەکان، چونکە هەستەکان لە پۆلێنکردنیاندا دەکەونە ژێر ئەسلێکی مەعریفی لەو بەرز و بالاتر. بەلام لەگەلْ ئەوەشدا ئەو شتەی کە وا دەکات ئەو شتانەی کە هەستەکانمان دەرکی پێبکەن –بەو پێیە کە ئەو دەرکپێکردنە ئەزموونێکی خاوە– شتێکی پەسەندە و لە ڕووی ماناوە شتێکی عەقلگیر بێت، ئەوە هەر عەقلە.دەکرێ ئێمە چاوێکمان هەبێت پێی ببینین، بەلام لەوانەیە شتەکان بە شێوازی لێلی ببینێ ئەویش – با بۆ نموونە بلێین – لە بەرئەنجامی داڕووخانێکی دەمارییەوە بێت[٢٢].

هەروەها دەکرێ ئێمە گوێمان هەبێ، بەلام لاوازبین لە بیستن، چونکە لەوانەیە هەلمان بژاردبێت بۆ خۆمان کە نەمانەوێ شتانێکی دیاریکراو ببیستین. دەکرێ عەقلێکی تیژ و کارا و بەبڕشتمان هەبێت، بەلام لەوانەیە لە کێشە و ناکۆکییەکی یاساییدا نەگەینە دەرئەنجامێکی راست و دروست – با بۆ نموونە بلێین –، حەزمان بۆ بردنەوەی کێشەکە زالْ دەبێت بەسەر بڕیاری حوکمەکەماندا. کەوابوو هێزە هەستییەکانمان ئەرکی خۆیان لە نێو میانەیەکی فراوانتری بارودۆخی چەمکی و سۆزداریی و رەوشتیماندا جێبەجێ دەکەن. پرۆسەی گەیشتن بە هەقیقەتی هەر شتێکیش ئەزموونێکی یەکبوونیی دەخوازێ کە پرەنسیپ و پێوەری هەستی و مەعریفی و دەروونی و رەوشتی دێنەناو پرۆسەکە و بەشداردەبن تیایدا. پێشەوا غەزالی، کە شوێن گەنجینەی فیکری پێش خۆی کەوتووە لە لێکۆلینەوەکەیدا پشت بە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) دەبەستێ، پارچە هەستییەکان بەوە پێناسە دەکات کە (سەربازی دلْ)ن، پاشان دەلێ: (دلْ لە حوکمی پادشادایە،

---

[٢٢] بەراورد بکە لە نێوان ئەمە و ئەوەدا کە زەردەشت بەو خەلکانەی وت کە گرنگییان پێنەدا، تا بە ناچاریی وتی: (ئایا کەسێك هەیە بێت یەکەمجار گوێیان بدڕێنێ تا بە چاویان فێری بیستن بن؟)، نیتشە (هکذا تکلم زرادشت)، وەرگێڕانی: ج. هولینغدیل، میدلسیکس، کتێبەکانی بنگوین،١٩٦١، ل٤٥.

سـەربازەکانیش لـە حـوکمی خزمـەتکار و هاوکارانـدان)[23]. تەنانـەت کـاتێ لـە ڕووی جەستەییەوە فەرمانە ڕاست و دروستەکان بۆ پارچـەکانی هەسـت جێبـەجێ دەکـرێن، ئەوا پشت بە سەلامەتی دڵ و پاکوخاوێنی دڵ دەبەستێ.

خوای گەورە عەقڵی بەخشیوە بە کەسی مرۆیی و لێـرەوە لـە توانایدایـە بگـات بـە هەقیقـەتی شـتەکان، بـەڵام لەوانەیـە لـە بەرئـەنجامی لایـەنی مـن و خـود و حـەزە جەستەییەکانەوە پەردە بدرێت بەسەر عـەقڵی و حـوکمی عەقڵەکەیـدا و تـووش ببێـت، ئەمەش وای لێبکات توانای نەمێنێ بەسـەر جیـاوازیی خـستن و وردبینینـدا، لەوانەشـە خۆی بخەڵەتێنێ و واگومـان ببـات کـە دەزانـێ، بـەڵام لـە بەرئـەنجامی سروشـتی مـنی قیرسیچمە و حـەزی دەسـتەڵات لـەبیری بـچێتەوە. هـەر لێرەوەیـە کـە قورئـانی پـیرۆز هۆشداری دەدات و دەفەرموێ: (أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً * أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً) (الفرقان: ٤٣ـ ٤٤). واتە: (ئایا ئەو کەسەت بینیوە، کـە هـەوا و هەوەسـی خـۆیکردووە بـە خـودای خـۆی؟! ئایـا تـۆ دەبیتـە پاسـەوان لەسـەری؟!، یـا وادەزانـێ زۆربـەیان گوێـدەگرن یـا تێدەگـەن؟! بێگومـان ئەمانـە هـەروەکو ئـاژەڵ وانـە، نـەخێر بـەڵکو گومڕان). هەر لە مانای ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا هـاتووە کـە (واتـە ئەوانـە حاڵیـان لـە حاڵی ئاژەڵی بەرەڵا خراپترە، ئەو ئاژەڵە هەر ئەوە دەکات کە بـۆی دروسـتکراوە، ئـەو مرۆڤانەش بۆ ئەوە دروستکراون تا خوای تاك و تەنها بپەرستن، بەڵام لە جێگـای خـوا کەسی تر دەپەرستن و هاوەڵی بۆ دادەنێن، ئەمە لە کاتێکدا کـە بەڵگـەیان پێـدراوە و پێغەمبەرانیان بۆ نێردراوە، کەچی نەبیستن و نە عەقڵیان سوودیان پێنەگەیاندن[24].

قورئـانی پـیرۆز بـەردەوام دەبـێ و بـە دەنگێکـی زوڵاڵ و بـە هەژموونـەوە بەگـژ ئەوانەدا دەچێت کە بە حیسابی خۆیان دەبینن و دەبیستن، بەڵام ڕاسـتیەکەی ئەوەیـە

---

[23] الإمام الغزالي، روضة الطالبين و عمدة السالكين، لە کۆمەڵە پەیامەکانی پێشەوا غـەزالی، بـەیروت، دار الکتب العلمية، ١٩٩٤، ل٣٢.

[24] إبن كثير، تفسير القران العظيم، بيروت، دار المعرفة، ٢٠٠٠، ص١١٤١.

که چاویان داپۆشراوه و نابینێ. خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ الصُّمَّ وَلَوْ كَانُواْ لاَ يَعْقِلُونَ * وَمِنهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُواْ لاَ يُبْصِرُونَ * إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئاً وَلَـكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ) (يونس: ٤٢- ٤٤)، واته: (هەندێکیشیان گوێت لێدەگرن، ئایا ئەتۆ ئەتوانی کەڕ تێبگەیەنیت، گەر عەقڵ و ئاوەزیان نەبێت؟!، هەندێکیشیان سەیرت دەکەن، ئایا ئەتۆ دەتوانی کوێر شارەزاکەیت؟! هەچەندە هیچیش نەبینن؟!، خودا ئەوەندەی تۆزقاڵێ زوڵم و ستەم لە کەس ناکات، بەڵکو خەڵکن خۆیان ستەم دەکەن).

هەروەها دەفەرموێ: (وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ) (الأعراف: ١٧٩)، واته: (بێگومان ئێمه زۆربەی جنۆکە و مرۆڤمان بۆ دۆزەخ دروستکردووە، چۆن ئەمانە دڵیان هەیە و نایخەنە کار بۆ تێگەیشتن، چاویان هەیە و پێی نابینن، گوێیان هەیە و پێی نابیستن، ئەمانە وەك ئاژەڵ وانە، بەڵکو خراپتر و گومڕاتریشن، هەر ئەوانەش غافڵ و بێئاگاکانن). ئەمەی پێشەوە ئاماژە دەدات که بە تەنها هەبوونی پارچە هەستییەکان زەمانەتی دەرککردن بە راستی ناکات، هەروەها خودی زانستی ئەزموونی بە تەنها خۆی لە توانایدا نییە هەقیقەتی شتەکان بدۆزێتەوە، بەڵکو دەبێ دڵ و پارچە هەستییەکان کە (سەربازی دڵن) سەلامەت بن، خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعاً وَأَبْصَاراً وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُون) (الأحقاف: ٢٦)، واته: (سوێند بێت بە خوا، ئێمه دەستەڵاتێکمان بە ئەوان دابوو، کە لەو دەسەڵات و سامانەمان بە ئێوە نەداوە، بیستن و بینین و بیرکردنەوەمان پێدابوون، بەڵام بیستن و بینین و بیرکردنەوەکەیان، هیچ سوودێکی پێنەدان، چونکه ئەوان بێبڕوابوون بە نیشانەکانی خودا، ئەوەش کە تیتاڵی و گاڵتەیان پێدەکرد گەمارۆی دان).

نــەتوانایی بیــنین و بیــستن و هەســتەکانی تــریش لــە بەرئــەنجامی کــەموکورتی بایۆلۆژییەوە نەهاتووە، بەڵکو سەرچاوەکەی داخستنی زەین و دڵە لـە بینـینی هـەق و راستی. ئیبن کەسیر دەڵێ: (واتــە ســوودمەند نـابن لـەو پارچـانەی جەسـتە کـە خـوای گـەورە کردوونـی بـە هۆکـاری هیدایـەت بۆیـان)،[٢٥] دەکـرێ لـە هەنـدێ لایەنـەوە ئەمـە بەراورد بکرێ بەو هەوڵە نەزۆکـە کـە لـەپێناو روونکردنـەوەی رەنگـەکان بـۆ نابینایـەك بەخـەرج دەدرێ. چـونکە ئـەو جیابوونـەوە بوونییـە ئـەو نابینایـە جیادەکاتـەوە کـە ئەزموونی رەنگەکان نابینێ، ئەوا هەر گوتـارێ دەربـارەی رەنگـەکان دەکاتـە مـەحاڵ. بـەڵام گـەورەترین هەڵـە لـەو گومانبردنەدایـە گوایـا ئێمـە مـادامێ چـاومان هەیـە ئـەوا شتەکان دەبینین، لە راستیشدا ئێمە نابینین[٢٦].

قورئانی پیرۆزیش جەخت دەکـات کـە (بیـنین) لـە رووی بینـینی هەقـەوە بنـەمای عەقڵگیری دەخوازێ کە بەرزترە لە هـەردوو پارچـەی مـاددیی بیـستن و بیـنین. خـوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاء إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ * وَمَا أَنتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ) (النمـل: ٨٠ـ ٨١). واتە: (بێگومان ئەتۆ ناتوانی مردووەکان تێبگەیەنیت، ناشتوانی ئەو بانگەوازەش بەو کەڕانەی کە کاتێ پشت هەڵدەکـەن رابگەیـەنیت، ئـەتۆ شـارەزاکەری ئـەو کوێرانـە نیت، لە رێ لـێ ونبـوون و گومڕاییەکانیانـدا، ئـەتۆ بێجگـە لـەو کەسـانەی کـە بـڕوا بـە نیشانەکانی ئێمە دێنن و موسڵمانن، ناتوانی کەس تێبگەیەنی).

کەوابوو هەر ئەوە بەس نییە کە پارچەکانی جەستەی مرۆڤ سـاغ و سـەلامەت بـن، بەڵکو پێویستی بە هیدایـەت هەیـە بـۆ بەرچـاوڕوونی و دانـایی، هـەروەك ئیفلاتـۆن لـە وتووێـژی لەگـەڵ فیـدرۆس ٢٥٠دا دەڵـێ: (بیـنین ئـەو هەسـتەیە کـە لـە نێـوان هـەموو هەسـتەکانی تـری جەسـتەدا زۆرتـر شـتەکان دەبـینێ و تاریکاییـەکان دەبـڕێ، کەچـی

---

[٢٥] تفسير إبن كثير، ص٦٥٩.

[٢٦] بڕوانە: مارتن هايدغر، مـا الـذى يـسمى فكـرا؟، ترجمـة: ج ج غـري، نيويـورك، كتـب هـاربر، ١٩٦٨، ص١٦٥.

وێڕای ئەوە هەر حیکمەتی پێ نابینین). بۆیە دەبێ دڵ چاك و ساغ و پارێزكار و پاك بێت تا بتوانێ وەك پێویست ئەو ئەركەی جێبەجێی بكات كە پێی سپێردراوە. حەكیمی ترمزی كە (ساڵی/٩١٠) كۆچی دوایی كردووە، لە كتێبێكی گرنگدا كە دەدرێتە پاڵی، پوختەیەكی نووسیوە و تیایدا پشتی بەستووە بە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت)، دەڵێ: (لە ڕاستیدا چاكبوونی پارچەكانی جەستە وابەستەن بە چاكبوونی دڵەوە، خراپبوونیشیان لە بەرئەنجامی خراپیی دڵەوەیە)[٢٧]. كەواتە ناوسنگ و دڵ و ناوكرۆك كە ترمیزی بە بلیمەتییەكی گەورە پوختەیەكی لەسەر وتووە، ئەركی خۆی بەو پێیە كە پارچەی جیاكراوەیە جێبەجێ ناكات، دەربارەی ئەم تێڕوانینە بۆ دڵ و پەیوەندی لەگەڵ تەواوی خواپێداوە خۆڕسكەكان و هێز و پارچەكانی هەست، فەرموودەیەكی بەناوبانگی موحەممەد پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) هەیە كە دەفەرموێ: (ألا إن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله وإذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب). واتە: (بزانن كە پارچە گۆشتێك لە جەستەدایە ئەگەر چاك بوو ئەوا جەستە هەمووی چاك دەبێت و ئەگەر پیس و خراپ بوو ئەوا هەمووی جەستە پیس و خراپ دەبێت، دە بزانن كە ئەویش دڵە). جا لەبەرئەوە كە دڵ جێگای باوەڕپێكراوە، ئەوا هەردوو مەعریفەی هەستی و تێگەیشتنی تێدا كۆدەبێتەوە و ئەزموونێكی یەكبوونیی بۆ واقیع پێشكەش دەكات.

هەروەها قورئانی پیرۆز جەخت دەكات لەسەر زەروورەتی فەراهەمهێنانی سەلامەتی و پایەدارییەكی تەواو بۆ هێزە هەستی و دەروونی و عەقڵییەكانمان تا مەعریفەمان پێ ببەخشرێ، ئامۆژگاریمان دەكات بە زەویدا بسووڕێینەوە و گەشت بكەین، ئەم گەڕانەمان بەو مانایەیە تا سەیری دیمەنی كامڵی بوون و مێژوو بكەین بۆ ئەوەی هەر كارە و لە جێگای خۆیدا دابنێین: خوای گەورە دەفەرموێ: (أَفَلَمْ يَسِيرُوا

---

[٢٧] أبو عبدالله محمد بن علي الحكيم الترمذي، بيان الفرق بين الصدر والقلب والفؤاد واللّب، عمان: المركز الملكي للبحوث و الدراسات الاسلامية، ٢٠٠٩، ص١٥.

فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ) (الحج: ٤٦). واتە: (ئایا بەسەر ئەم زەوییەدا نەگەڕاون؟ تا ببنە خاوەنی دڵێك كە پێی تێبگەن، ببنە خاوەنی گوێیەكیش پێی ببەستن، بێگومان چاوەكان كوێر نابن، بەڵام ئەو دڵانە كوێر دەبن كەوان لە ناو سینەكاندا).

كاتێك دڵ كوێر دەبێت ئیتر هەموو پارچەكانی تری جەستە لەڕێ لادەدەن و ستەم دەكەن، هەر لێرەشدا مەترسییەكی هاوشێوە هەیە كە خۆی لە كارێكدا حەشارداوە بەپێی گومان ئیش بكات و هیچ بەڵگەیەكی راست، یان بناغەیەكی پتەوی نەبێ، هەرگیز ناكرێ عەقڵ وەك راستییەك گومانی لاپەسەندبێت. جا ئەگەر بێین توێژینەوەیەكی زانستی بكەین، یان بە دوای بناغەی باوەڕێكی ئایینیدا بگەڕێین، ئەوا پێویستمان بە زانیاریی زیاتر و زۆرتر لە گومان هەیە تا ئەوەی كە بانگەشەی بۆ دەكەین كە راستییەكی حاشاهەڵنەگرە بونیادی بنێین لەسەری. هەمان پرەنسیپ دەچەسپێ بەسەر پەیوەندییە مرۆییەكان و هەڵوێستە ڕەوشتییەكاندا (بڕوانە: سورەتی الحجرات: ١٢). ئەوە حەق و ڕاستییە كە دەبێ بكرێتە بناغە بۆ هەڵبژاردنی باوەڕ نەك گومان: (قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ قُلِ اللّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ أَفَمَن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لاَّ يَهِدِّيَ إِلاَّ أَن يُهْدَى فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ * وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلاَّ ظَنّاً إَنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئاً إِنَّ اللّهَ عَلَيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ) (یونس: ٣٥- ٣٦). واتە: (بەڵێ: ئایا لەو شەریكانەتاندا كەسێكتان هەیە، ڕێنوێنی بكا بەرەو هەق و راستەقینە؟! بڵێ: تەنها خودا ڕێگە پیشاندەدا بۆ لای هەق و راستەقینە و زیاتر شیاوی ئەوەیە پەیڕەوی بكرێ، یا ئەو كەسەی هەتاكو ڕێنوێنی نەكرێ، ڕێ دەرناكات؟! كەواتە ئێوە چیتانە، چۆن فەرمان و بڕیار دەدەن؟!، زۆربەی زۆریان جگە لە گومان، شوێن هیچێكی تر ناكەون، لە راستیشدا گومان یەك تۆزقاڵیش مرۆڤ لە هەق و راستەقینە بێنیاز ناكا، بە راستی خودا ئاگاداره بەسەر ئەو كارانەدا كە

ئەنجامی دەدەن). هەروەها لە سورەتی (الانعام) ئایەتی: ١١٦دا هەمان باس سەیر بکە.

بەوپێیەش کە دڵ فەرمانڕەوای ڕەسەنە بەسەر خوداپێداوە خۆڕسکە هەستی و مەعریفییەکاندا، ئەوا بەڵگەی سەلمێنەرمان دەداتێ و یەقینمان پێدەبەخشێ، بەڵام ئەمەش لەسەر ئەوە وەستاوە پارێزگاری بکرێ لە دڵ تا بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، ئەمەش بە هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ عەقڵ و دەروونیدا دەبێ، تا یەقین و پایەداری و دڵئارامی (لە شانشینی جەستەی مرۆیی)دا[28] جێگیر ببێ. هەروەها بەپێی ئەنترۆپۆلۆجیای ڕۆحی لە قورئاندا، دەبێ مرۆڤ بەردەوام بایەخ بدات بە دڵ و عەقڵ و ویژدانی خۆی و خۆی بپارێزی لە خراپە و لە ناڕەوایی، کاتێ مرۆڤێکیش ڕێ ون دەکات، ئەوا بە ڤیرسیچمەییەوە دێ ناڕەوای لێدەبێ بە ڕەوا و ئاڵوگۆڕیان پێدەکات، ئەم حوکمەشی لەسەر گومانی ڕووت و حەزی خودی و خۆپەرستی بونیادناوە، خۆی ڕاهێناوە لەسەر عادەتێکی زەینی دیاریکراو و هێزی جیاوازخستنی لە نێوان هەق و ناهەقدا ونکردووە، کاتێکیش ئەمە ڕوودەدات، کە کارێکی دەگمەنیش نییە چونکە قەبە و قورسایی دەستەڵاتی هەوا و هەوەس و ئارەزووەکان عەقڵی پڕووکاندووە، (مۆر) دەنێ بەسەر دڵیدا و ویژدانی بزر بکات، بۆیە نابێ تێگەیشتنمان بۆ دەستەواژەی قورئانی (ختم الله علی قلوبهم) تێگەیشتنێکی زۆرلێکردن و دەستەڵات لەدەستدانی مرۆڤ بێت، بە جۆرێ واتێبگەن کە خوای گەورە بێباوەڕیی داناوە بۆ کەسانێکی دیاریکراو و بە زۆرەملێ وایلێکردوون، چونکە ئەم مانایە دژ و پێچەوانەی ئاڕاستەی ئەو پەیامەیە کە قورئانی پیرۆز هێناویەتی.

---

[28] ئەم دەستەواژە سەرنجڕاکێشە بۆ ماناکان هی (شاه ولي الله دهلوي)یە، (١٧٦٢ مردووە)، کە یەکێکە لە گەورەزانایانی نیمچە کیشوەری هیندیی. هەروەها نزیککردنەوەی تەواوکاری لە نێوان بیرمەندە ڕەسەنەکانی ئیسلام لەبارەی کەسی مرۆییەوە کورت دەکاتەوە. بڕوانە کتێبەکەی: (حجة الله البالغة)، قاهیرە، دار التراث، بێبەروار، بەرگی٢، ل٨٩.

راستیەكەی ئەوەیە كاتێ مرۆڤ بەردەوام دەبێ لەسەر ئەنجامدانی هەمان هەڵەی هـزری و رەوشتی و پەشیمان نابێتەوە، ئەوا رادێ لەسەر بەسووك سەیركردنی عـەقڵی خـۆی، ئەو كەسانەش كە پێدادەگرن و بەردەوام دەبن لەسەر ئەنجامدانی هەڵە و تـاوان، ئـەوا خوای گەورە بەرەڵلایان دەكات لـەو حاڵەتـەدا كـە وان تیایـدا. چـەندین ئایـەتی پـیرۆز هەن وەسفی ئەم داخستنەی دڵ و عەقڵ و ویـژدان دەكـەن كـە بـە مانایـەكی هزریـی و رەوشــتی چــوونیەك خەســارەتمەندییەكی تــەواو روون و ئاشــكرایە، خــوای گــەورە دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُـونَ * خَـتَمَ اللّـهُ عَلَى قُلُوبِهمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَـى أَبْـصَارِهِمْ غِـشَاوَةٌ وَلَهُـمْ عَـذَابٌ عظِـيمٌ) (البقـرة: ٦ــ ٧). واتـە: (بـە بێگومـان ئـەو كەسـانەی كـە بێـبڕوان چ بیانترسـێنیت و چ نەیانترسـێنیت، لەلایان یەكسانە هەر ئیمان نایـەنن، خـودا مـۆری نـاوە بەسـەر دڵـەكانیان و گوێیانـدا، پەردەش وا بەسەر بیناییەكانیانەوە، سزای گەورەش بۆ ئەوانە). هەروەها دەفەرموێ: (وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْراً وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ آيَةٍ لاَّ يُؤْمِنُواْ بِهَا حَتَّى إِذَا جَآؤُوكَ يُجَادِلُونَكَ يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِـينَ) (الأنعام: ٢٥). واتە: (هەندێكیان گوێت لێـدەگرن، بـەڵام چـەندەها پـەردەمان كێـشاوە بەسەر دڵەكانیاندا، تا تێی نەگەن، گوێكانیشمان كەڕ كردوون، ئەگەر چاویان كەوێ بـە هـەموو بەڵگـە و نیـشانەكانیش هێـشتا هـەر بـڕوای پێناكـەن، دەڵـێن ئەمـە بێجگـە لـە ئەفسانەی پووچی پێشینیان هیچی تر نییە). هەروەها دەفەرموێ: (تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُـونَ تَـسْبِيحَهُمْ إِنَّـهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً * وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّـذِينَ لاَ يُؤْمِنُـونَ بِـالآخِرَةِ حِجَابـاً مَّسْتُوراً * وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُـوبِهِمْ أَكِنَّـةً أَن يَفْقَهُـوهُ وَفِـي آذَانِهِـمْ وَقْـراً وَإِذَا ذَكَـرْتَ رَبَّـكَ فِـي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ وَلَّوْاْ عَلَى أَدْبَارِهِمْ نُفُوراً) (الإسراء: ٤٤ـ ٤٦). واتە: (حەوت ئاسمان و زەوی و هەموو ئەوانەش كە لە ناویاندان، پاك و خاوێنی و بێخەوشیی خودا دەردەبـڕن، هـیچ شتێك نییـە یـاد و سـوپاس پەسـنی خـودا نـەكات، بـەڵام ئێـوە لـە زیكـر و سـوپاس و پەسنەكانیان تێناگەن، بە راستی خودا نەرموونیان و لەسەرخۆ و لێبوردەیە، كاتێ كـە

قورئان دەخوێنی، پەردەیەکی شاراوە و نادیار دەخەینە نێوان تۆ و ئەوانی کەوا ئیمان بــە پەســلان نــاهێنن، پــەردەش دێــنین بەســەر دڵ و دەروونیانــدا بــا تێنەگــەن، گوێچکەکانیشیان کەڕ دەکەین، هەرکاتێکیش لە ناو قورئاندا پەروەردگارت بە تــەنیایی ناو دەبەی، بە ڕق و کینەوە پشتیان هەڵدەکـەن و، بـەرەو دوا دەکشێنەوە. هـەروەها دەفەرموێ: (إِذَا جَاءكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ * اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّهُمْ سَاء مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ) (المنـافقون: ١ـ ٣). واتە: (کە دووڕووەکان هـاتن بـۆلات، دەڵێن: ئێمـە شـایەتی دەدەیـن بێگومـان ئەتۆ پێغەمبەری خودای، بە ڕاستی خوداش دەزانێ کە تۆ پێغەمبەری ئەویت، خوداش شایەتی دەدات بێگومان دووڕووەکـان درۆزنـن، سـوێندخواردنەکەیان کـرد بـە قـەڵغانی خۆیان، ئینجا کۆسپ و تەگەرەیان خستەسەر ڕێبازی خودا، لە ڕاستیدا ئەو کارەی کـە دەیانکرد ئێجگار خراپ بوو، ئەمەش هەر لەبەر ئـەوە بـوو، کـە ئەوانـە بڕوایـان هێنـا و پاشــان پاشــگەز بوونــەوە، ئینجـا مـۆر نـرا بەســەر دڵ و دەروونیانــدا، ئـیتر ئەوانــە تێناگەن).

لە بەرانبەریشەوە ئەوانەی کە دڵ و ویـژدانیان بـە ڕوونـاکیی بـاوەڕ درەوشـاوەیە، ئەوا بە زیکری خـوای گـەورە ئاشـتی و ئـارامی دەسـتەبەر دەکـەن، ئـەو (ویژدانـە) نـە کارێکی هەڵچوونە و نە شتێکە زادەی خەیاڵ بێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەدات لـە کرۆکـی بوونمان، لەلایەکەوە دەمانبەسـتێت بـە خـوای گـەورەوە و بـە واقیعـی شتەکانیـشەوە لەلایەکی ترەوە، پاشانیش ڕێنمایی هزر و ڕەفتارمان دەکات لە ژیاندا، ژیـان پڕدەکـات لە مانـا بەسـوودەکان، لەبەرئـەوە قورئـانی پـیرۆز دەفـەرموێ: (الَّـذِينَ آمَنُـواْ وَتَطْمَـئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) (الرعد: ٢٨). واتە: (ئەو کەسـانەی بـڕوا و ئیمانیان هێناوە و، دڵەکانیان بە یادی خودا ئارام دەگـرێ، ئاگـاداربن دڵـەکان هـەر بـە یادی خودا ئارام دەگرن!). هەروەها دەفەرموێ: (هُـوَ الَّـذِي أَنـزَلَ الـسَّكِينَةَ فِـي قُلُـوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَـزْدَادُوا إِيمَانـاً مَّـعَ إِيمَـانِهِمْ وَلِلَّـهِ جُنُـودُ الـسَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضِ وَكَـانَ اللَّـهُ عَلِيمـاً

حَكِيماً) (الفتح: ٤). واتە: (هەر ئەو خودایە کە ئارامی و هێمنایەتی رشت بەسەر دڵ و دەروونی ئیمانداراندا، تا بڕوای دیکە لەگەڵ بڕواکەی خۆیاندا زیاد بکەن، هەموو سوپای ئاسمانەکان و زەوی هەر هی خودایە و خوداش زانا و کاربەجێیە).

بە کوردی و بە پوختی، دەبێ ویژدانمان لە بارێکی ساغ و سەلامەت و شوێنگەیەکی راست و دروستدا بێت بۆ ئەوەی عەقڵمان وەك پێویست ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات.

## عەقڵ و بوون و بوونەوەر

دەستەویەخەبوونی تەواو لەگەڵ واقیعدا دادەنرێ بە پێکهاتەیەکی سەرەکی بۆ ئەو وشە و زاراوە قورئانیانە کە تایبەتن بە بەبیرکردنەوەوە، ئەوانە لەو پەیوەندییە زەروورییەوە هەڵدەگۆزرێن لە نێوان عەقڵ و بووندا هەیە. جا هەرچەندە وشەی (بوون–وجود) لە قورئانی پیرۆزدا بەکار نەهێنراوە، بەڵام ئەو چوارچێوەی پراکتیکی چەمکییە کە جیهانی دروستکراوی تێدا دەردەکەوێ، ئاماژە دەدات بە سیستمی بوون و دروستکراوی جوانی خوای گەورە تیایدا. جا بەوپێیە کە بوون بناغەی هەموو هەبووەکانە، ئەوا بەخششی دروستکراوی خوای گەورەیە و پشتگیری و درێژەپێدانی لە پەروەردگارەوەیە. بەم واتایەش ئەوا بوون تێڕوانینی پەروەردگارە بۆ جیهانی دروستکراو، جیهانی دروستکراو نموونەی جۆراوجۆری بوون دەخاتە پێش چاو، هاوکات چەندین وێنەو شێوەی دیاریکراو دەخاتە پێش چاو و بە تایبەتی تیشکیان دەخاتەسەر، ئەمە لە کاتێکدا ئەو وێنە یان پارچانەی بوون سیفەتی جیاواز و جۆراوجۆریان هەیە، بەڵام هەرهەموویان بەو سیفەتە کە لەسەر بناغەی هەقیقەتی بوون دامەزراون، یەکدەگرن و یەکبوونیان تێدایە. دەستەواژەی قورئانی (هەموو–كُلّ) کە لە ئایەتە بوونەوەرییەکاندا چەندین جار بەکارهێنانی دووبارە دەبێتەوە، ئاماژە بۆ

ئەو لایەنەی بوون[٢٩] دەدات: واتە هەموو شتێك پەیوەستە بە یەكەوە، چونكە خوای گەورە خۆی دروستكاری هەموو شتێكە. هەر ئەو خوای گەورەیەیە (بكلّ شيء محيطا) وەك باسمان كردووە.

بەم میانەیەش عەقڵ پەیوەندی گونجاوی خۆی لەگەڵ بووندا دەبینێتەوە، ئەم بوونە خۆی لە خۆیدا عەقڵگیرە، چونكە خوای گەورە لەسەر جوانترین سیستم دروستیكردووە، ئەوەش كە خوای گەورە دروستی دەكات مانا و مەبەستێك و عەقڵگیری خۆی حەشارداوە تیایدا. ئەم ئایەتە پیرۆزەش مەبەست لە دروستبوون و بیركردنەوە و پاڕانەوە پێكەوە كۆدەكاتەوە، خوای گەورە دەفەرمویّ: (أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاء رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ * أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ) (الروم: ٨- ٩) واتە:(ئایا لە دڵی خۆیاندا هیچ بیرێكیان نەكردووەتەوە؟ كە خواوەند ئەم ئاسمانانە و، ئەم زەوییە و ئەوەی لە نێوانیاندایە، بەهەق و راستی بە كاتی دیاریكراو نەبیّ، بەدی نەهێناون و دروستی نەكردوون؟ بێگومان زۆربەی ئەم خەڵكە بێبڕوان بەوەی كە بە خزمەت پەروەردگاری خۆیان بگەن. ئایا نەگەڕاون بەسەر ئەم زەوییەدا؟! تا سەیركەن بزانن سەرئەنجامی ئەو كەسانەی كە لەپێش ئەواندا بوون چۆن بووە؟! ئەوان لەمان بەهێزتر بوون، سەرزەوییان هەڵگێڕایەوە، زیاتر لەمانیش ئاوەدانیان كردەوە، پێغەمبەرەكانیشیان بە بەڵگە و نیشانەی روونەوە هاتن بۆلایان، كەواتە خودا نەیدەویست ستەمیان لێبكا، بەڵام خۆیان بوون ستەمیان لە خۆیان كرد).

---

[٢٩] ئەم پێشەكییە لۆژیكییە بناغەی بەڵگەیەكی ترە كە ئەم سیستمە باشترین جیهانی بوونە، كە توانایی خوای گەورە بەدیهێناوە. بۆ ئاشنابوون بە دەقی ئەم بەڵگەیە (باشترین سیستم)، بڕوانە: كتێبی: ملا صدرا، حول نظرية العدالة الالهية وأفضل العوالم الممكنة، مجلة أكسفورد للدراسات الاسلامية، ١٨: ٢ (٢٠٠٧)، ص١٨٣-٢٠١.

خوای گەورە هەرچی دروستکردووە و دروستی دەکات، بەوپەڕی دانایی و بە مەبەست و بە وردی و توندوتۆڵی دروستیکردووە و دروستی دەکات، خوای پاك و بێگەرد سەرچاوەی باڵا و کۆتای هەموو بوون و عەقڵگیرییەکە، هەرخۆی ئەم سیفەتانە دەبەخشێ بە دروستکراوی خۆی و بە مانا و بە مەبەستی روون سیستمی بوون تێروتەسەل دەکات، بۆیە دەبێ لەم میانەیەدا لەم گوتە پڕمانایە بگەین کە دەڵێ: (یەکەمین شتێ کە خوای گەورە دروستیکردووە، عەقڵ بووە). عەقڵ لێرەدا ئاماژەیە بۆ پرەنسیپە گشتییەکانی هەقیقەت و سیستم و ئەو عەقڵگیرییە کە خوای گەورە خستوویەتە نێو سروشتی شتەکان، کەواتە عەقڵ یەکەمین شتە خوای گەورە دروستیکردووە، چونکە پەروەردگاری پاك و بێگەرد شتەکانی بەپێی سیستم و پرەنسیپێکی دیاریکراو دروستکردووە. (عەقڵ نزیکترینی دروستکراوەکانە لە هەقیقەتەکانی خوایی)[30]. مانایش بە پێچەوانەی رەوتی خودی نوێ تەنها سیفەتێکی جیاکەرەوەی عەقڵ نییە، چونکە عەقڵیش وەك زانست وایە، ناکرێ دابڕنرێ و هەروەك لای دیکارت هەیە قەتیس بکرێ لە کۆمەڵە پرۆسەیەکی زەینی ناوەکیدا، ناکرێ مانا — بەپێی گالیلۆ — بسڕێتەوە، ئەگەر بە سیفەتێکی لقی و لاوەکیش هەژمارکرا، ئەوا عەقڵ هەر لە سەرووی شتەکانەوە دایدەنێ. جا مادامێ مانا بەرهەمی زەین نییە، بەڵکو هەر گوزارشی لێدەکات و یارمەتی دەدات، ئەوا کرۆکی مانا دەکەوێتە دەرەوەی پێکهاتە زەینییە پەیوەندیدارەکان.

لە ڕاستیدا بابەتی ڕەوشتیی ئەم پێشەکییە ئەوەندە ڕوون و ئاشکرایە: واتە کە بە ڕێگایەکی ناخودیی مانا و مەبەستێکت هەبێت، ئەوا دەخوازێ هەستێکی گەورەت بە بەرپرسێتی هەبێت. ئیقرارکردنی ئێمە و هەروەها بوونەوەریش کە بۆ مەبەستێك دروستکراوین، مانای ئەوەیە بەرپرسێتی ڕەوشتی لە دەرەوەی خۆمان پەسەند بکەین، قورئانی پیرۆزیش ڕاستەوخۆ مرۆڤ دەدوێنێ و جەخت لەسەر ئەم مانایە دەکات: خوای گەورە دەفەرموێ: (أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ * فَتَعَالَى اللَّهُ

[30] محمد علي التهانوي، كشاف إصطلاح الفنون والعلوم، بيروت: دار الكتب العلمية، بەرگی سێیەم، ل٣٠٧.

الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ) (المؤمنون: ١١٥ ـ ١١٦). واتـه: (ئایـا واتـان دەزانی هەر بە گاڵتە دروستمان کـردوون و ناشـگەڕێنرێنەوە بـۆ لامـان!، پلـەو پایـەی خـودا کـە فـەرمانڕەوای ڕاسـتەقینەیە بـەرزە، بێجگـە لـەو هـیچ خودایـەك نییـە، پەروەردگاری تەختی بەڕێزە).

(أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى) (القيامة: ٣٦). واتـه (ئایـا مـرۆڤ وادەزانـێ هـەروا بەرەڵا دەکرێ و پشتگوێ دەخرێ؟!)، ئەوەیش کە پەیوەندە بە بوونەوەرەوە، خـوای گەورە شتەکانی دروستکردووە و ئەو یاسایانەشی داناوە و بەدیهێناوە کە ئەو شتانەی پێدێنێ، ئەو یاسایانەش پێیان دەوترێ سوننەتی خوای گەورە، پـشتگیری دەکـەن لـە پرەنسیپی یاسا و گونجاندن و بەردەوامبوون لە بوونەوەردا.

ئـەوە ئـەرکی عـەقڵی مرۆڤـە کـە ئـەو پرەنـسیپە گـشتی و سـیفەتە کرۆکـی و سەرەکییانە بدۆزێتەوە و بیانخاتەڕوو. عەقڵیش بە هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنی لەگـەڵ ئەو پرەنسیپانەدا بەشدار دەبێـت لـەو سیـستمە عەقڵگیرییـەی بوونـەوەردا. عـەقڵ لـە توانایدایـە کرۆکـی شـێوەکانی عـەقڵگیری بدۆزێتـەوە، چـونکە کۆمەڵـە پرەنـسیپێکی عەقڵگیری لە سروشتی واقیعدا بوونیان هەیە. هەروەها لـە تواناماندایـە بـە عـەقڵ و بـە زانست شیکاری بوونەوەر بکەین، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە خۆی بۆ ئـەم توێژینـەوە و بەدواداگەڕانە پێشکەش دەکات. قورئانی پیرۆزیش هیچ دژایەتی و ناکۆکییەك لە نێـوان لێکۆڵینــەوە لــە بوونــەوەر وەك دیاردەیــەکی سروشــتی و نێــوان ســەیرکردنی وەك موعجیزەیەکی باڵای خوایی نابینێ.

هەموو بوونەوەر بەڵگـە و نیـشانەیەکە لـە خـوای گـەورەوە بـۆ خـەڵکی و بەڵگەیـە لەسەر شتێك کە باڵادەسـتترە و سـنووری ئـەوی تێپەڕانـدووە. قورئـانی پـیرۆز هـەمان وشـەی (بەڵگـە– آیـة) بـەکاردەهێنێ بـۆ ئامـاژەدان بـە بەڵگـەکانی خـوای گـەورە و بەڵگەکانی تریـشی لـە بوونـەوەردا، کـە دەکـرێ بـەراوردی بکـەین بـەو وشـەیە کـە لـە لاتینیدا پێی دەوترێ Vestigia Dei. فرەمانابییش بۆ وشەی (آیة) ئـەو پەیوەندییـە قووڵە دەسەلمێنێ کە لە نێوان بەڵگەکانی خوای گـەورەدا کـە لـە قورئانەکەیدایـە و لـە

نێوان بەڵگەکانی تری کە لە جیهانی دروستکراودا هـەن: هـەردوو جۆرەکـانی بەڵگـە لـە خـوای گـەورەوەن، هەردووکیـشیان پـیرۆزن، دەبـێ مامەڵـەمان لەگـەڵ هەردووکیانـدا لەوپەڕی وردی و سەرکەوتووییدا بێت، دەخوازن بە ئەمانـەت و پابەنـدبوونی تۆکمـەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێـت. بەڵگـەکانی خـوای گـەورە لـە هـەردوو ماناکـەدا ڕاسـتەوخۆ پەیوەستە بـە عـەقڵ و عەقڵگەراییـەوە، چـونکە ڕاسـتەوخۆ ئاڕاسـتەی عـەقڵی مرۆیـی کراوە تا مرۆڤ بتوانێ لـە واقیعـی شـتەکان بگـات کـە نـاودەبرێن بـە (عـەقڵی تیـۆری)، پاشـانیش ڕێگـای چـاکەکاری و بەختـەوەری دەگرێتەبـەر کـە نـاودەبرێ بـە (عـەقڵی پراکتیکی)، هەر واقیعێکـی بنـەڕەتی و مـاددیی وەك هـەژمارکردنی ژمارەکـانی سـاڵ و کۆنترۆڵکردنی کات لە ڕاستیدا (بەڵگە– آیة)ن بۆ کەسانێ کە بـە سیـستمی بوونـەوەر و وردی ڕێکوپێکیەکەی بیردەکەنەوە: خوای گەورە دەفەرموێ: (هُوَ الَّـذِي جَعَـلَ الـشَّمْسَ ضِيَاء وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللّهُ ذَلِكَ إِلاَّ بِـالْحَقِّ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ * إِنَّ فِي اخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَـا خَلَـقَ اللّـهُ فِـي الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ) (يونس: ٥ـ ٦). واتـە: (هـەر ئەویـشە ڕوونـاکی بەخـشی بـە هەتاو، تیشکیشی بەخشیوە بە مانگ، چـەند قۆنـاغی بـۆ دیـاری کـردووە، بـۆ ئـەوەی ژمارەی ساڵەکان بزانن و، حیساب فێـر بـبن، خـودا ئەوانـەی بـە حـەق و ڕاسـتی نـەبێ دروست نەکردووە، خودا نیشانەکان جوان شیدەکاتەوە، بۆ هۆزێـك لێـی تێبگـەین. بـە ڕاستی لـە ئـاڵوگۆڕی شـەو و ڕۆژدا و، لەوانەشـدا کـە خـودا لـە ئاسمانـەکان و زەوییـدا بەدیهێناون، بەڵگە زۆرن بۆ ئەو هۆزەی پارێزکارن).

خوای گەورە ئەم بەڵگانە بۆ خەڵکی دەخاتەڕوو تـا بتـوانن عـەقڵیان بـەکاربهێنن و دەرئـەنجامێکی عـەقڵانی لـۆژیکی لـێ دەربهێـنن، کـە ئـەویش باوەڕهێنانـە بـە خـوای گەورە. هەر بەڵگەیەك لە قورئان و لە بوونەوەردا داوای وەڵامدانەوە و بەدەمەوەچـوون دەکات لە لایەن مرۆڤەوە. هەروەك (ئیزوتسۆ) ئاماژەی پێداوە، خەڵکی لە توانایاندایـە ئـەم ئایـەت و بەڵگانـە بـە خوێندنەوەیـەکی ڕاسـت و دروسـت بخوێننـەوە و بـاوەڕ بـە هەقیقەتەکـەی بکـەن، ئەگـەر نـا ئـەوا لـە بـەکارهێنانی عەقڵیانـدا شکست دەخـۆن و

دەکەونە ژێر هەوا و هەوەس و حەزەکانیانــەوە. پاشـتر ڕاسـتێتی ئـەو بەڵگانــە بــە درۆ دەنەخەوە، جا لە کاتێکدا بەپیرەوەچوونی یەکەم سەردەکێشی بۆ بـاوەڕێکی راسـتگۆ و یــەقین و دڵنیاییــەکی تــەواو، ئــەوا هەڵوێــستی دووەم خاوەنەکــەی دەخاتــە نێــو بێبــاوەڕیی و قیرسیــچمەییەوە[31]. هــەر خوێندنەوەیــەکی هەڵــە بــۆ بەڵگــە روون و ئاشکراکانی خوای گەورە، جیامان دەکاتەوە لە واقیع و لەوانەیـە رزگاربوونمـان بخاتـە بەردەم مەترسی: خوای گەورە دەفەرموێ: (وَقَالُوا لَوْ كُنَّـا نَـسْمَعُ أَوْ نَعْقِـلُ مَـا كُنَّـا فِـي أَصْحَابِ السَّعِيرِ) (الملك: ١٠). واتــە: (وتيـان: ئەگــەر ئێمـە گوێمـان بگرتایـە و بـەوردی بیرمـان لێبکردایەتــەوە، لــە دۆزەخییــەکان نــەدەبووین). تــەنها کەسـانێك لــە مانــای راســتێتی بەڵگــەکان تێدەگــەن و بــەپێی ئــەوان کاردەکــەن ئەوانــەن کــە عــەقڵیان بەکاردەهێنن: خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ) (آل عمران: ١١٨). واتــە: (... هــیچ گومـانی تێـدا نییـە، هـەموو بەڵگـە و ئایەتێکمان بۆ ئێـوە روونکردووەتـەوە، ئەگـەر ئاوەزتـان پێـی بـشکێ). ئەوانـەش کـە عەقڵیان پێی دەشکێ بۆیان هەیە دەستبکەن بە کردنـەوەی جفـرەی زمـانی نـازارەکی بوونەوەر، ئەوکات تێدەگـەن کـە چـۆن ملکـەچ و تەسـلیمی خـوای گـەورە دەبـن، ئـەم حیکمەتە قووڵە یارمەتیمان دەدات جیاوازیی نێوان نابینا و بینا ببینین. قورئانی پیرۆز بە رەوانبێژییەکی کاریگەر جەخت دەکات کە هەر نکوڵیکردنێ لە بوونی خوای گەورە و دانانی هاوەڵ بۆی پێـچەوانەی سروشـتی شـتەکانە و پێـشێلکردنی پرەنـسیپی عەقڵـە: خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعـاً وَكَرْهـاً وَظِلالُهُـم بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ * قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ قُلِ اللّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَـاء لاَ يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعاً وَلاَ ضَرّاً قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَـلْ تَـسْتَوِي الظُّلُمَـاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُواْ لِلّهِ شُرَكَاء خَلَقُواْ كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُـلِ اللّـهُ خَـالِقُ كُـلِّ شَـيْءٍ وَهُـوَ الْوَاحِـدُ الْقَهَّـارُ) (الرعـد: ١٦). واتــە: (ئــەوەی لــە ئاسمانــەکان و زەویدایــە، بــە

[31] توشیهیك إیزوتسو، (خودا و مرۆڤ لە قورئاندا: ماناکانی تێڕوانینە گەردوونییـەکانی قورئـان)، طوکیـو: معهد کیو للدراسات الثقافیة واللغویة، ١٩٦٤، ص١٣٦-١٣٧.

ڕەزامەندی یا بە زۆر، سێبەرەکانیشیان بە بەیانی و ئێوارانداء، تەنیا بۆ خـودا کڕنـووش دەبەن و ملکەچن. بڵێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و ئـەم زەوییـە کێیـە؟ بڵـێ خودایـە، بڵێ: ئایا بێجگە لە خودا سەرپەرشتانێکتان بۆ خۆتان داناوە؟! کە دەستەڵاتی قـازانج و زەرەری خۆیانیان نییە، بڵێ: ئایا کوێر و چاوسـاغ وەك یـەك وان؟! یـاخۆ تـاریکی و ڕوونـاکی وەکـو یـەکن؟! یـا هاوەڵانێکیـان بـۆ خـودا بڕیـارە داوە، دروسـتکراوێکیان دروستکردووە وەکو دروستکراوی ئەو، لە ئەنجامدا ئـەم دوو بەدیهێنانـەیان لێـشێواوە، بڵێ هەرخودا بەدیهێنەری هەموو شتە، هەرئەویشە تاق و تەنیا و دەستەڵاتدار).

کاتێکیش ئەمـە ڕوون دەبێتـەوە، ئـەوا بیـنین و سـەیرکردن و شـیکاری لـۆژیکی و تێڕامان و پاڕانەوە هەرهەموویان دەچنە پـاڵ یـەك و یـەك کـار دەکـەن: خـوای گـەورە دەفەرموێ: (وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَـدِيرٌ) (آل عمـران: ١٨٩) (إِنَّ فِي خَلْقِ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْـتِلاَفِ اللَّيْـلِ وَالنَّهَـارِ لآيَـاتٍ لِّـأُوْلِي الألْبَـابِ * الَّـذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْـقِ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَـا مَـا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ * رَبَّنَا إِنَّكَ مَـن تُـدْخِلِ النَّـارَ فَقَـدْ أَخْزَيْتَـهُ وَمَـا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ * رَّبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِياً يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُواْ بِـرَبِّكُمْ فَآمَنَّـا رَبَّنَـا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأبْرَارِ * رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَـى رُسُـلِكَ وَلاَ تُخْزِنَـا يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ إِنَّـكَ لاَ تُخْلِـفُ الْمِيعَـادَ) (آل عمـران: ١٨٩ــ ١٩٤). واتـە: (فەرمانڕەوایی ئاسمانەکان و زەوی بەدەست خودایە، خوداش بەسـەر هـەموو شـتێکدا توانایە، بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا لە ئاڵوگۆڕ و هاتوچـۆی شـەو و ڕۆژدا، بەڵگـە و نیـشانەی زۆر هەیـە بـۆ ئەوانـەی خـاوەنی عـەقڵ و ئـاوەزن. بەڵگـە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی وا لە هەڵسان و دانیـشتن و ڕاکشاندا، لـە یـاد و زیکـری خـوداداندا، بیریـش لـە دروسـتبوونی ئاسمانـەکان و زەوی دەکەنـەوە و، دەڵـێن: ئـەی پەروەردگاری ئێمە! ئا ئەمانەت هەروا بە پووچی و بێهودە دروست نەکردووە، پاکی و خاوێنی بۆتۆیە، کەواتە بمانپارێزە لە سزای ئاگر، ئەی پـەروەردگاری ئێمـە! بێگومـان هەرکەسێکت خستە ناو ئـاگرەوە، زەلیـل و زەبوونـت کـردووە و، سـتەمکارانیش هـیچ

جـۆره یارمەتیـدەرێکیان نییـە. ئـەی پـەروەردگاری ئێمـە! بێگومـان گوێمـان لێبـوو بانگخوازێك بانگی دەکرد بـۆ باوەڕهێنـان، (دەیـوت) ئیمـان بێـنن بـە پـەروەردگارتان، ئێمەش خێرا ئیمان و باوەڕمان هێنا، ئەی پەروەردگاری ئێمە! جا تۆش چاوپۆشـیمان لێبکـە و لـە گوناهـەکانمان خـۆش ببـە، درێوییـەکانمان داپۆشـە، لەگـەڵ چـاکەکاراندا بمانمرێنە، ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەو بەڵێن و وادانەش کە بە هۆی پێغەمبەرانتـەوە بە ئێمەت دا بۆمانی بەدیبهێنە، لە ڕۆژی پەسڵانیشدا سەرشـۆڕمان مەکـە، تـۆ هـەرگیز بەڵێن ناشکێنیت).

هــەر لەبــەر ڕۆشــنایی قورئــانی پــیرۆزدا، دروســتکردنی بوونــەوەر لــە لایــەن پــەروەردگارەوە ئێجگـار عەقڵگیرییـە، ئەوەنـدە بەڵگەنەویـستە کـە ئەگـەر هۆکـاری ناعەقڵانی نەبنە ئاستەنگ ئەوا عەقڵ پەی بەمە دەبات و ڕاستەوخۆ ئیقراری پێدەکات. ئەم هۆشیاری و دەرکپێکردنـی راسـتییە لـە ڕێگـای پەیپێبردنـەوە دەبێتـە بناغەیـەکی ناوەکی بۆ لایەنێکی گەورە لە زانستی ئـەزموونی و تێگەیشتنمان. ئـەو کەسانەی کـە هەر بـە بینـینی هـەق ئیقـراری پێدەکـەن، لـە واقیعـدا ئەوانـە بـە شـێوەیەکی ڕاسـت و تەواوی عەقڵیان بەکاردەهێنن. لە قورئانی پیرۆزدا وشـەی (أولـي الألبـاب) هـاتووە بـۆ ئەوەی جیایان بکاتەوە لەوانە کە تەنها بایەخ بـە زیرەکـی بوونیـان دەدەن. (الألبـاب) کۆی (لُب) واتە کرۆك و ناخی شت، ئاماژەیە بـۆ دەرکپێکردنێکـی قـووڵ بـۆ هەقیقـەتی شتەکان کە بە عەقڵمان لێیان تێدەگەین. ئیبن کەسیر لە ڕاڤـەکردنی (أولـي الألبـاب)دا دەڵێ: (واتە ئەو عەقڵە کامڵ و زیرەکانە کە دەرك بە هەقیقەتی شـتەکان دەکـەن نـەك بەوەی کە دیـار و لـە بەرچـاوە)[٣٢]، پێـشەوا (قـرطبي) وەسـفیان دەکـات بـە (ئەوانـەی عەقڵیان لە تێڕامان و سەرنجدانی بەڵگەکاندا بەکاردەهێنن)[٣٣].

جا کاتێ عەقڵ لـە شـوێنی بـەکارهێنانی ڕاسـت و دروسـتی خۆیـدا دادەنـرێ، ئـەوا پلەی تێگەیشتنی نوێ بەدەست دەهێنێ، هاوکـات نیـشانەی جیاکـاریی تیـژ لـە نێـوان

---

[٣٢] إبن كثير، ص٣٣٤.

[٣٣] أبو عبدالله القرطبي، الجامع لأحكام القرآن، بيروت: دار إبن حزم، ٢٠٠٤، بەرگی١، ل٧٨٠.

عـەقڵكاریی و تێڕامـان و پاڕانـەوەدا نـاهێڵێ، ئەمـە كـاتێ دێتـەدی كـە مـرۆڤ یـەقین و دڵنیایی بەدی هێنابێ و هیچ جۆرە گومانێكی تایبەت بە هەقیقەتی ئەو شـتەوە كـە لـە بەردەمماندا دەوەستێ، نەهێشتبێتەوە. لەمبارەیـەوە قورئـانی پـیرۆز گرنگییـەكی زۆر دەدات بە جەختكردن لەسەر سروشتی سەلمێنراویی و ڕوون و ئاشكرای هەق بـەوە كـە قەدەغەی كردووە بە زۆر خەڵكی بهێنرێنە نێو ئیسلام.

بەڵكو لە جیاتی ئەوە دەبێ توانایان هەبێت بە خودی خۆیـان هـەق ببیـنن، خـوای گەورە دەفەرموێ: (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَـيَّنَ الرُّشْـدُ مِـنَ الْغَـيِّ فَمَـنْ يَكْفُـرْ بِالطَّـاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِـالْعُرْوَةِ الْـوُثْقَىَ لاَ انفِـصَامَ لَهَـا وَاللّـهُ سَـمِيعٌ عَلِـيمٌ) (البقـرة: ٢٥٦). واتـە: (هـیچ جـۆرە زۆرلێكردنێـك لـە ئایینـدا نییـە، بێگومـان ڕێـی ڕاسـت لـە كـوێرەڕێ، شـارەزایی لـە گـومڕایی جیابووەتـەوە، ئینجـا هەركـەس بـڕوا بـە تـاغوت و سـتەمكاران نـەكات و بـڕوا بهـێنێ بـە خـودا، بێگومـان ئـەوە دەسـتیگرتووە بـە دەستگیرەیەكی پتەو، كە هەرگیز پچڕان و پسانی بۆ نییە، خوداش بیسەر و زانایە).

لە ڕاستیدا (زمانی بوونەوەر) وەك وەحیەكی دیار و لەبەرچاو لە دیمـەنی فـەرمانی جیـددی و كۆمەڵـە یاسـا و پرەنـسیپێك و نموونەیەكـدا هـاتووە بـۆ عـەقڵی مرۆیـی، لـە هەمان كاتیشدا لە دیمەنی هێما و چیرۆك و نموونەی بـەهێزدا هـاتووە. قورئـانی پـیرۆز هیچ جۆرە دژایەتییەك لە نێوان حوكمە لۆژیكییە توندەكان كە لەسەر سیفەتە باڵاكانی پـەروەردگار هـاتوون و لـە نێـوان هێماییـەتی دروسـتكراودا نـابینێ، قورئـانی پـیرۆز بانگهێشتمان دەكات بۆ دۆزینەوەی ئەو سیستمە نموونەییە تەواوە كە خوای گەورە لە بوونـەوەردا دروسـتیكردووە، چـونكە بـوونی سیـستم و هەماهـەنگی ڕێكوپێـك تێیـدا بەڵگەیە لەسەر بوونی دروستكارێكی دانا، بەڵام لە هەمان كاتدا ئەوە لە ئێمە چاوەڕێ دەكرێ پەی ببەین بە زمانی هێمایی بوونەوەر كە چۆن چۆنی لە هەموو ئان و ساتێكدا و بەبێ دابڕان حەمد و سەنا و سوپاسـی خـوای گـەورە دەكـات: (تُـسَبِّحُ لَـهُ الـسَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُـونَ تَـسْبِيحَهُمْ إِنَّـهُ

كَانَ حَلِيماً غَفُوراً) (الإسراء: ٤٤)[٣٤]. واتە: (حەوت ئاسمان و زەوی و هەموو ئەوانەش کە لەناویانـدان، پـاك و خـاوێنی بێخەوشـی خـودا دەردەبـڕن، هـیچ شـتێك نییـە یـاد و سوپاس و پەسنی خودا نەکات، بەڵام ئێوە لە زیکر و سوپاس و پەسنەکانیان تێناگەن، بە ڕاستی خودا نەرمونیان و لەسەرخۆ و لێبوردەیە).

لە ڕاستیدا بە هەر نزیکبوونەوەیەك لە دابڕان و داڕنین و عەقڵگەرایی ئەوا دەرکپێکراوە مەعریفییەکانمان لە قاڵب دەدات و توانا خەیاڵییە داهێنەرەکانمان تووشی وشکبوون دەکات و لە باریدایە ڕێگریمان لێبکات لە تێگەیشتن لە زمانە ناگوتارییەکەی بوونەوەر. جیهانی دروستکراو بەردەوام گوفتاری لەگەڵ دروستکارەکەیدا هەیە، چونکە جیهانێکی موسڵمانە.

(أَفَغَيْرَ دِينِ اللّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ) (آل عمران: ٨٣). واتە: خۆی ڕادەستی خوای گەورە کردووە و ملکەچی کردووە. هەر بەم سیفەتە خەڵکیش بەشدار دەبن لەگەڵ سروشتدا و تاکە خاڵێکی سەرەکی کە جیایان دەکاتەوە لە سروشت ئەوەیە کە: خەڵکی ئیرادەیەکی ئازادیان هەیە و لەسەریانە باوەڕ هەڵبژێرن و بیدەن بەسەر بێباوەڕیدا، هەق بدەن بەسەر ناهەقدا، چاکەکاری بدەن بەسەر خراپەکاریدا[٣٥].

---

[٣٤] ئەم ئایەتە و چەندین ئایەتی تری هاوشێوەی ئەم، بناغەی ئەو ڕا باوە لە کەلەپووری ئیسلامییدا پێکدەهێنن کە تەواوی بوونەوەر ژیانی تێدایە و (هەموو شتێکیش ڕۆحی تێدایە)، بڕوانە: تفسير إبن كثير، ص٩٣٢. هەروەها بڕوانە: ملا صدرا، أجوبة المسائل الكاشانية، في مجموعة رسائل فلسفية لصدر المتألهين، تحقيق: حامد ناجي أصفهاني، طهران: إنتشارات الحكمة، ١٣٧٥هـ، ص١٣٧. هەروەها بڕوانە: (المعرفة في الفلسفة الإسلامية المتأخرة، ص٢٢٩ – ٢٣٢.

[٣٥] (التهانوي) لە پاش ئەوە کە گوتەی یەکێك لە پیاوە داناکان دەهێنێ، ئەم کارە بەوە وەسف دەکات کە: (خوای گەورە عەقڵی بێئارەزووی داوە بە فریشتەکان، ئارەزووی بێعەقڵیشی داوە بە ئاژەڵەکان، هەردووکیانیشی داوە بە ئادەمیزاد، جا هەرکەسێ عەقڵی زاڵبوو بەسەر ئارەزووەکەیدا، ئەوا لە فریشتەکان باشترە، هەرکەسیش ئارەزووەکەی زاڵبوو بەسەر عەقڵیدا، ئەوا لە ئاژەڵەکان خراپترە). محمد علي التهانوي. كشاف إصطلاحات الفنون، بەرگی٣، ل٣١٤.

ئەو کەسەی کە هەستی بەرچاوڕوونی کامڵ دەبێ، ئەوا لە توانایدایە بە پـەیبێبردن و هەڵهێنان دەرك بە زیکری بوونەوەر بکات کـە سوپاسـی خـوای گـەورە دەکـات، ئـەو بیرکردنەوەی هەڵهێنانە (خـەیاڵفراوانی) لـە دەرەوەی دیمـەنی عەقڵـەوە نییـە، چـونکە عەقڵ — هەروەك لێرەدا دەمەوێ بیسەلمێنم — لە توانایدایە بگونجێ و هەماهەنگ بێت لەگەڵ کۆمەڵێ دەستەواژەی نافەرمیدا کـە پەیوەنـدن بـە هەقـەوە و لـە توانایدایـە لـە بینراوە ناگوتارەییەکان تێبگـات، ئەوانـەی کـە لـە دەسـتەویەخەبوونمان بـە واقیعـەوە دەستمان دەکەون.

## عەقڵگەرایی و ڕەوشت

بیرکردنەوەی پەیپێبردن و هەڵهێنان (حدس) کاریگەری خۆی هەیـە لـە هەڵبژاردنـە ڕەوشتییەکاندا، بەو پێیەیش کە پرەنسیپە ڕەوشتییەکان لە زۆربەی حاڵەتدا شـتانێکی سـەلمێنراو و بەڵگەنەویـستن، ئـەوا ئێمـە دەزانـین چـۆن چـۆنی لـەو بارودۆخـەدا هەڵسوکەوت بکەین، بەڵام ئایا هـەر بـەوە کـە بەڵگـەی سـەلمێنراو و بەڵگەنەویستمان بەدەستەوە بێت، ئیتر بەسە تابتوانین ڕەفتارمان پاکیزە و چاکەکار بێـت؟ جـا لەبـەر ئەوە کە هێزی پاڵنەری سۆزە مرۆییەکان بەهێزن، ئەوا بە تەنها بـەکارهێنانی ڕاسـت و دروستی عەقڵ نە لە توانایدایە و نە بە بەردەوامی بەسە بۆ هەڵبژاردنی ڕەوشتی ڕاسـت و دروست. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە دەبێ هەردوو — سیفەتە جیاکەرەوەکەی مـرۆڤ — واتە عەقڵ و ئیرادە لە یەکدا کۆبکەینەوە تا ڕەفتارمان تەبا بێت لەگەڵ بیروباوەڕمـان. بە پێچەوانەی دیکارتەوە کە کەسی مرۆیـی ناودەبـات بـە (ئامێرێکـە و بیردەکاتـەوە)، ئەوا ئێمەش بوونەوەرین و ئەوەمان دەوێ. لێرەدا (ئیرادە) بە تەنها تایبەت نـاکرێ بـە هەڵبژاردنی خواستێکەوە جیا لە خواستەکانی تر، بەڵکو ئاماژەیە بۆ توانابیمان لەسـەر هەڵبژاردن لە نێو ئەگەرە بەردەستەکاندا، بەڵام بـە مانـای بـەهای ڕەوشـتی (ئـیرادە)، واتە هەڵبژاردنی هەق بەسەر ناهەقدا و چاکە بەسەر خراپەدا. عەقڵ و عەقڵگەرایی بـەو مانـا فراوانـەی کـە مـشتومڕمان لەسـەر کـرد، هەڵدەسـتێ بـە ڕێنمـاییکردنی

هەڵبژاردنـەکانمان و پێکهێنـانی واتـای ڕەفتـاریی ڕەوشـتمان. کەواتـە عەقڵگـەرایی و ڕەوشتیی دەست لە نێو دەستن، چونکە ئێمە گیاندارێکی عاقـڵ و لـە هـەمان کاتیـشدا بوونەوەرێکی ڕەوشتدارین.

لە قورئانی پیرۆزدا ئەم کارە لە باسـی نێـوان بـەکارهێنانی عـەقڵ و دەستخـستنی هەستی ڕەوشتی و نێوان ڕۆحی پڕچەك بە لە ترسانی خوای گەورە باسـکراوە. وشـەی پارێزکاری (التقوی) کە بە عادەتی بە مانای وریابوونەوە و بەئاگایی و تـرس لـە خـوای گەورەوە وەردەگیردرێ — لـە زمانیـشدا واتـە پارێزگـاری و پاراسـتن لـە مەترسـی، لـە بەکارهێنانی شەرعیدا پارێزکار (التقوی) واتە (پاراستنی دەروون لە تاوان)[٣٦].

بەپێی ئەو مانایەش لە فەرموودەی پیرۆزدا پارێزکاری (التقوی) هاتووە، واتـە: بـە گەورە ڕاگرتنی خوای گەورە لە دڵدا بە جۆرێ وەها کە دەروون بپارێزێ لە هـەر نـاڕەوا و تاوان و خراپە و ناشیرینێك. بەم مانایەش ئەوا مانای چەمکەکانی تێگەیشتن واتە لـە هەردوو چەمکی عەقڵ و پارێزکاریدا لە یەکەوە نزیك دەبنەوە.

واتە هەردووکیان ئاماژە دەدەن بە هـەوڵی هۆشـیاریمان بـۆ پاراسـتنی خۆمـان لـە سـەرئەنجامی نـامرۆیی و ناڕەوشـتی تـاوان و سـتەم و گەنـدەڵی. کەواتـە: (عاقـڵ ئـەو کەسەیە لە پەروەردگارەکەی بترسێ و لێپرسینەوە لە خۆی بکات)[٣٧].

هەروەها بناغەی رەوشـتیش بـۆ هەڵبـژاردنی چاکە بەسـەر خراپـەدا و چاکەکاری بەسەر خراپەکاریدا دەچێتە ژێر ئەم پرەنسیپەوە. هیچ تەمومژێ یەخەی عەقڵ نـاگرێ کاتێ کە دێ وەك پرەنسیپێکی رەوشتی و رۆحی پارێزکاری لاپەسەندە، چـونکە رابـەر و رێنماکارمانـە لـە هەڵبـژاردە رەوشـتییەکانماندا. هـەروەها هـەتا عـەقلگیری و مانـا و ئـیرادە لەیەکـدا کۆنەکەینـەوە، ئـەوا بەوپێیـە کـە گیانـدارێکی عـاقڵین مرۆییبوونمـان دەستەبەر نابێ. هەروەها هەڵبژاردە رەوشتییەکان لە ڕووی عەقڵیـەوە پەسـەندن نـەك تەنها لەبەر ئەوە کە هەڵبژاردەی ئازادانەی خۆمانن، بەڵکو لەبەرئەوەشـە کـە رێگامـان

---

[٣٦] الراغب الأصفهاني، المفردات في غريب القرآن، ص٨٣٣.

[٣٧] التهانوي، كشاف إصطلاحات الفنون، ج٣، ص٣١٤.

پێدەدات بەشداربین لە سیستمی عەقڵگیری بوون و دواتر وامان لێدەکات بتوانین خۆمان تێپەڕێنین و بگەین بە هەقیقەتێکی گەورەتر. هەروەها بەپێی کەلەپووری جێماوەی رەوشتیی ئیسلامیی، ئەوا بەهێزکردن و شکۆمەندکردنی دادپەروەری و سەرخستنی دادەنرێ بە شتێکی عەقڵ پەسەند و مانادارە، چونکە دادپەروەری واتە: (دانانی شتێك لە جێگای راست و دروستی خۆیدا)، هەر لەسەر ئەم رەوشە، ئەوا دژایەتیکردنی ستەم و بەرەنگاربوونەوەی کارێکی عەقڵگیرە، چونکە ستەم واتە: (دانانی شتێك لە غەیری جێگای خۆیدا)، واتە وێرانکردنی ئەو سیستمە کە مانا بە شتەکان دەبەخشێ. هەرکارێکیش پڕاوپڕ بچەسپێ لەگەڵ واقیعی شتێکدا و بە ڕاددەی پێویست بایەخیدا بە شوێنی راست و دروستی، ئەوا دادەنرێ بە کارێکی عەقڵانی. کارێکی تەواو عەقڵگیرە کە مرۆڤ خۆی لە هێز و حەزەکانی خۆپەرستی و لەخۆباییبوون و تاوانی وێرانکار بپارێزێ، هەرکارێك پێچەوانەی ئەمەبێ، دژە لەگەڵ بنەمای مرۆڤایەتیمان. بۆ کورتکردنەوەی ئەم خاڵانە ئیبن مەسکویە دەڵێ: (... ئەگەر دادپەروەری بریتی بێت لە پێدانی ئەو مافەی کە پێویستە بدرێ بەو کەسە کە پێویستە بیدرێتێ، ئەوا شتێکی مەحاڵە خوای گەورە کە ئەم هەموو خێروخێراتە گەورەیەی پێبەخشیوین، ئەرکێکی نەبێ کە پێویست بێ خەڵکی پێی هەستن و جێبەجێی بکەن)[٣٨]. کەوابوو دەتوانین ئەو دەرئەنجامە بەدەست بهێنین کە کارێکی عەقڵانییە مرۆڤ کەسێکی رەوشتدار بێت، بەپێی چەمکی پێچەوانەش، هەرکارێکی ناڕەوشتی کارێکی ناعەقڵانییە، چونکە دژە لەگەڵ بەرژەوەندییە کەسایەتییەکان و پێشێلکردنی سیستمی شتەکانیشە، لەم بەرانبەرەوە بە زیان دەگەڕێتەوە سەرمان، چارەسەری قورئانی پیرۆز بۆ هەڵبژاردە رەوشتییەکان و چۆنێتی دانانیان لە دووتوێی میانەیەکی فراوانتری بووندا، پرەنسیپی عەقڵگەرایی دەچەسپێنێ، چونکە پێکهاتەی سەرەکی رەفتاری رەوشتیمانە. بەڵام پێچەوانەکەشی هەر راستە: کە عەقڵگەرایی — لە

---

[٣٨] أحمد بن محمد بن مسكويه، تهذيب الأخلاق، ترجمة: قسطنطين زريق الى الانكليزية، بيروت: جامعة بيروت الأمريكية، ١٩٦٨، ص١٠٦.

وەرگرتنی تەواوی هێزیدا – سەردەکێشیێ بۆ رەفتاری رەوشتی و درێژدەبێتەوە بۆ تەواوی خەڵکی و پاشتریش بۆ بوونەوەر و دواجار لە لای پەروەردگار کۆتایی دێ. بەپێی قورئانی پیرۆز، خەڵکی عەقڵیان پێبەخشراوە، لە لایەکەوە بۆئەوەی جیاکاری بخەن لە نێوان راست و هەڵە و لە نێوان چاکە و خراپەدا لە لایەکی ترەوە. هەروەها بە زمانی زانستی راست و دروست و بە رەفتاری رەوشتی، ئێمە عەقڵمان بەکاردەهێنین تا هەستێ بە هەڵبژاردە راستەکان، ئەمەش لێرەدا هیچ پەیوەندییەکی نییە بەو مشتومڕ و دەمەقاڵە ناسراوەوە کە لە نێوان زانا عەقیدەناسە موسڵمانەکاندا هەیە دەربارەی ئەو مەسەلەیە، کە ئەگەر ئێمە زانیبێتمان ئایا ئەو شتانە راست و باشن چونکە خودی ئەو شتە هەرخۆی وایە، یان خوای گەورە هەر بەوشێوەیە دروستیکردووە. لێرەدا خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە بیرکردنەوەی راست و رەفتاری رەوشتی تەواوکەری یەکترین، لێرەوە هەردووکیان هەرجۆرە دابەشکردنێ لە نێوان عەقڵ و عەقڵگەرایی و باوەڕ و رەوشتدا رەتدەکاتەوە. ئیبن حەزم دەڵێ: (سوودی زانست لەوەدایە چاکە گەورەکان بەکاربهێنێ... دەبێ زانست لە هەموو چاکەیەکدا پشکی هەبێ، نەزانیش لە هەموو خراپەیەکدا پشکێکی هەبێ)[39]. ئیبن مەسکویە لە میانەیەکی هاوشێوەدا دێ ئەرکی عاقڵ دیاری دەکات و پابەندی دەکات پێیەوە، دەڵێ: (دەبێ کەسی عاقڵ لە دەروونی عاقڵی خۆیدا کە بە هۆیەوە بووەتە مرۆڤ بگەڕێ بە دوای چاکەدا، بە تایبەت سەیری ئەم عەیبە و کەموکوڕییانە بکات کە لەو دەروونەدا هەن بە هەوڵ و توانای خۆی هەوڵبدات نەیانهێڵێ و تەواویان بکات)[40].

---

[39] إبن حزم، الأخلاق والسير في مداواة النفوس، تحقيق: طاهر أحمد مكي، جدة، دارالمنارة، ٢٠٠٧، ص١٢٤.

[40] إبن مسكويه، تهذيب الأخلاق، ص٤٤. پاشانیش بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (دەروونی عاقڵ خۆراکی گونجاو بە خۆی هەیە، ئەو خۆراکەش زانستە، زیادکردنی ئەو شتانە کە عەقڵ بەجێن، خۆڕازاندنەوە بە راستگۆیی لە کاتی دەربڕینی راکاندا، هەق پەسەند بێت لە هەرلایەك و لەگەڵ هەرکەسدا بێت، دووركەوتنەوە لە درۆ و لە نارەوا، چۆن بێت و لە هەرکوێوە هاتبێت).

# عەقڵگەرایی وەك سیستمێكی لۆژیكی

لـە راسـتیدا گواسـتنەوە لـە عـەقڵ و عەقڵگەراییـەوە بـۆ رەفتـاری رەوشـتی و بـە پێچەوانەشەوە، بابەتێكی چەندجار دووبارەیە لە قورئانی پیرۆزدا و بناغەیەكی میراتـی رەوشتی ئیسلامی پێكدەهێنێ، جا كاتێ عەقڵ بە شێوەیەكی راست پـەروەردە دەبـێ، ئەوا سەردەكێشێ بۆ كاری رەوشتی، رەفتاری رەوشتیش لەلایەن خۆیەوە عەقڵ بەهێز دەكات. قورئانی پیرۆز ئەم پێوانە لۆژیكییە ساكارە بە كارێكی بەڵگەنەویست دادەنـێ. پەسەندكردن و رازیبوون بە كارێ كە راست و راسـتگۆیە پاشـان بێیـت بـە پێـچەوانەی ئەوەوە كاربكەیت، ئـەوە كـارێكی تـەواو دژ و پێـچەوانەیە. ئەمـە دووڕووییـەكی حاشـا هەڵنەگرە: خوای گـەورە دەفـەرموێ: (أَتَـأْمُرُونَ النَّـاسَ بِـالْبِرِّ وَتَنـسَوْنَ أَنفُـسَكُمْ وَأَنـتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَـابَ أَفَـلاَ تَعْقِلُـونَ) (البقـرة: ٤٤). واتـە: (ئایـا فـەرمان دەدەن بـە خـەڵك بـۆ ئەنجامدانی كاری چاك، خۆیشتان لەبیر دەچێتەوە؟! لـە كاتێكـدا كـە كتـێبی خـوداش دەخوێننەوە، بۆ عـەقڵ ئـاوەز نـاگرن؟!). قورئـانی پـیرۆز بـەو ئاسـتە كـە بێبـاوەڕیی رەتدەكاتەوە، بە هەمان ئاست دووڕوویـش رەت دەكاتـەوە و پێـی خراپـە، لـە هەنـدێ حاڵەتـدا زۆرتـر دووڕوویـی پێخـراپترە، چـونكە دووڕوویـی بـە تەنیـشت ئـەوەوە كـە شكستێكە بۆ ئیرادەی مرۆیی، هاوكات هەر پەیوەندییـەكی لـۆژیكی لـە نێـوان عـەقڵ و رەوشــتدا تێكــدەدات. دواتــریش دەمانخاتـــە نێـــو گێـــژاوی نـــاڕێكوپێكی سیـــستمی لۆژیكییەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُـونَ مَـا لَـا تَفْعَلُـونَ * كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ) (الصف: ٢ـ ٣). واتە: (ئـەی ئەوانـەی بـڕوا و ئیمانتان بەهێزە! بۆ شتێك دەڵێن كە خۆتان ئەنجامی نادەن؟!، زۆر مایەی تووڕەییـە بەلای خواوە، كە شتێك بڵێن و ئەنجامی نەدەن).

هەمان پرەنسیپی پێكەوەبەستنی لۆژیكی دەچەسپێ بەسەر باوەڕهێنان بە خـوای گەورە، ئەو ئایەتە قورئانیانـە كـە بـاس لـە بوونـەوەر دەكـەن و وەسـفێكی پرشـنگدار دەبەخشن بە چۆنێتی دروستكردنی خوای گـەورە بـۆ بوونـەوەر و مـرۆڤ، هەقیقـەتێكی واقیعی بەهێز دەدەن بە عەقڵگەرایی بەو سیفەتە كە رێكخەری سیـستمێكی لۆژیكییـە،

چونکه بەبێ هەڵاوێردکردن هەموو ئەو ئایەت و بەڵگانە کە مرۆڤ دەدوێنن بۆ ئەوەیە تا ئەو پەیوەندییە لۆژیکییە کە لە نێوان بوونەوەردا وەك سیستمیکی زۆر سەرسوڕهێنەرە و ئەرکەکانیشی لەوپەڕی وردیدان، هەروەها نێوان باوەڕهێنان بە خوای دروستکار کە ئەم بوونەوەرەی دروستکردووە، دەستەبەر ببێ. ئەوانەش کە باوەڕیان بە بوونی خوای گەورە هەیە لەولاشەوە هاوەڵی بۆ دادەنێن، ئائەوانە دژی خۆیان دەوەستنەوە و دژەکارێکی روون ئەنجام دەدەن، ئەوانەش کە باوەڕیان بە خوای گەورە هەیە و گرنگی نادەن بە هیدایەت و ڕێنماییەکانی، ئەوانە حاڵەتێکی روون لە ناڕێکوپێکی سیستمی لۆژیکی پیشان دەدەن.

وێڕای ئەوە کە ئەم ئایەتانەی لەمەوپاش دێن بەزەیی بێسنووری خوای گەورە لە دروستکردنی مرۆڤدا و بایەخپێدانی زەق دەکەنەوە، ئەوا لە هەمان کاتدا دەچنەوە بەگژ دژەکاری ناوەکی هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە، کە بە تاوانی گەورە و مەزن دەژمێردرێ، روونی دەکەنەوە کە هاوەڵدانان کارێکی ناعەقڵانی زۆر دیار و لەبەرچاوە، بەڵام ئەوانەی کە بیردەکەنەوە و سەرنجدەدن و عەقڵیان دەخەنەگەڕ، بەلایانەوە قورس نییە کە ئیقرار بە بوون و تاك و تەنهایی خوای گەورە بکەن، چونکە هەر ئەو پەروەردگارە شایانی ئەوەیە ئیقراری پێبکرێ و ملکەچی ببن، خوای گەورە دەفەرموێ: (أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ * أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَاراً وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَاراً وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ * أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قَلِيلاً مَّا تَذَكَّرُونَ * أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ * أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) (النمل: ٦٠ـ ٦٤). واتە: (یا ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە و، لەو ئاسمانەیشەوە ئاوی بۆ رشتونەتە خوارەوە، ئینجا هەر بەوئاوە باخ و باخاتی جوان و

رازاوەمـان رووانـد، کـە لـە توانـای ئێـوەدا نـەبوو دارەکـانی بـڕوێنن، ئایـا ئـیتر هـیچ پەرستراوێك لەگەڵ ئەڵڵادا هەیە؟! نـەخێر، بـەڵکو ئەمانـە هـۆزێکی لادەرن، هاوتـا بـۆ خـودا دادەنـێن، یـا ئـەو کەسـە کـە زەوی کردووەتـە جێگـای نیـشتەجێبوون، چـەم و رووباریـشی تیـا بـەدیهێناوە و، شـاخ و چیاشـی تێـدا دامەزرانـدووە، لـە نێـوان دوو زەریاشدا بەرهەڵستێکی داناوە، ئایا ئـیتر هـیچ پەرسـتراوێك لەگـەڵ ئـەڵڵادا هەیـە؟! نەخێر بەڵکو زۆربـەی ئەمانـە نـازانن، ئایا ئـەو کەسـەی کـە بـەهانای ئومێدبڕاوێکـەوە دەچێت، هەرکاتێك لێی پاڕێتەوە، گیروگرفتیش لادەبا، دەیشتانکات بـە جێنـشین لـەم سـەرزەوییەدا، ئایا ئـیتر هـیچ پەرسـتراوێك لەگـەڵ ئـەڵڵادا هەیـە؟! هـەر زۆر کـەم بیردەکەنەوە؟! یا ئەو کەسەی لە تاریکی بـەحر و بـەڕدا، ڕێگاتـان پیێیـشان دەدا، یـا ئـەوەی باکـان دەنێـرێ پـێش خێـر و بێرەکـەی مـزگێنی دەنێـرێ، ئایـا ئـیتر هـیچ پەرسـتراوێك لەگـەڵ ئـەڵڵادا هەیـە؟! خـودا زۆر لەوشـتە بـەرزترە کـەوا دەیکـەن بـە هـاوەڵی. یـا ئـەوەی ئـەم بوونـەوەرە بـەدی دێنـی و پاشـانیش دەیگێڕێتـەوە، یـا ئـەو کەسـەی کـە لـە ئاسمـان و زەوییـەوە ڕۆزی دەدا، ئایـا ئـیتر هـیچ پەرسـتراوێك لەگـەڵ ئەڵڵادا هەیە؟! بڵێ بەڵگەکەتان بێنن گەر راست دەکەن؟!).

ئــەم ئایەتــە پیرۆزانــە لێکنزیکبوونەوەیــەکی جــەدەلی بــەهێز دەخەنــەڕوو کــە جەختکردنەوەی قورئـانی بـۆ سیـستمی لۆژیکیـان تێدایـە، بـەو پێیـە کـە بناغەیـە بـۆ گوتارێکی گونجاو و ساغ دەربارەی پەیوەندی لە نێوان مرۆڤ و خوای گەورە لە لایـەك، هـەروەها لـە نێـوان خـوای گـەورە و بوونـەوەر لـە لایـەکی تـرەوە. عەقڵگـەرایی بـەو وەسـفەی کـە پێکەوەبەسـتنێك و سیـستمێکی لۆژیکییـە بـەو واتایـە دێ کـە ئێمـە لـە کۆمـەڵێ پێـشەکی ڕاسـتەوە دەگـەین بـە کۆمەڵـە دەرئـەنجامێکی ڕاسـت. ئەمـەش ئاماژەیەکە تا سەیری بەردەوامی گریمانەبوونیی و ڕەوشتییەکانمان بکەین کە تێبینییە ئەزموونییـەکانمان ئەوانـەی کـە پەیوەنـدن بـە بوونـەوەرەوە لـە میانەیـەکی بـاوەڕیی یەکتاپەرستیەوە سەردەکێشن بۆ کۆمەڵە دەرئەنجامە لۆژیکی، واتە ڕازیبوون بە خوای گـەورە کـە خوایـە و کـارکردن بـەپێی ئـەو بـاوەڕە. قورئـانی پـیرۆز ئـەم چـەمکە

ڕاپەڕێنەرەی عەقڵگەرایيە زۆر بەکاردەهێنێ و دەیچەسپێنێ بەسەر مەسەلە بوونەوەری و باوەڕی و شەرعییەکاندا. قورئانی پیرۆزیش زۆر دەچێت بە گژ بێباوەڕانی مەککەدا و بە زمانی بەزاندنیان دەیاندوێنێ و داوایان لێدەکات خۆیان بیربکەنەوە و بڕوانن بزانن ئایا ئەو بیرکردنەوە گومڕاکەرانەیان و دوور لە خوای گەورە هیچ مانایەکی عەقڵانی هەیە.

دەکرێ لە ڕووی عەقڵانییەوە دەربارەی خوای گەورە و بوونەوەر هەست بکەین بە بۆچوونێکی پەیوەست بە لۆژیکەوە، ئەویش بێت لە ڕێگای بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروست و ئەگەر لە تواناماندا بە شێوەیەکی قەناعەتپێکەر عەقڵمان بەکاربهێنین بۆ خوێندنەوەی بەڵگەکان لە جیهانی بینراودا.

## کۆتایی:
## ئایا بوار ماوە بۆ گەڕانەوە بۆ عەقڵ؟

بەپێی ئەو هەوڵەی تا ئێستا پێی هەستاوم، ویستوومە بیسەلمێنم کە عەقڵگەرایی وەك عەقڵگیریی وایە و لە دەرەوەی کردارە ناوەکییەکانی زەینێکی تاك و ڕزگاربوو لە هەر پەیوەستبوونێ دەمانجولێنێ و دەمانخاتە نێو میانەیەکی گەورەتری مانای بوون. میتافیزیکی دروستکردن چەمکێکی قورئانی عەقڵگەرایی بابەتی دادەمەزرێنێ کە وەرگیراوە لە کرۆکی عەقڵگیری جیهانی بوون.

زانستیش بەو سیفەتە کە پەردە لادەدات لەسەر سیستمی ڕەگداکوتاوی شتەکان و بیناکردنیان، ئەوا عەقڵگەرایی ئامێریی و خودی ڕەتدەکاتەوە، لە جیاتی ئەوە میانەیەك لە عەقڵگیریی دادەمەزرێنێ کە عەقڵ و بیرکردنەوەمان تیایدا ئەو ئەرکەیان پێیان سپێردراوە جێبەجێی دەکەن، ئەمەش بەدەمەوەچوون و وەڵامدانەوەی بانگەوازی واقیعە، لەو دیدەوە کە بناغەی بوونیی عەقڵ توانای تێدا دروست دەکات تا بەشداری بکات لە سیستمی عەقڵگیریی بووندا، پاشانیش دەیکاتە واقیعێك کە شوێن و

میانەیەك بە خۆی هەیە. هەروەها عەقڵ پرەنسیپێکی خودی ڕوون و دیارە ئەرکی خۆی لە ژینگەیەکدا ئەنجام نادات کە کورت کرابێتەوە لە وشەی من و خوددا.

قورئانی پیرۆزیش کە پەڕاوی وەحی و هیدایەتە، مامەڵەی لەگەڵ مرۆڤ و هزردا هەر بەو میانە فراوانترەیە بۆ سیستەمی دروستکراو و تایبەت بە بوونەوە. لە کاتێکدا کە دەبینین قورئانی پیرۆز متمانەیەکی تەواوی بە عەقڵی ساغ و دروست هەیە، لە هەمان کاتدا هۆشداری دەدات لە دابڕین و داڕنینی بوونیی و لووتبەریی مەعریفی و لەخۆباییبوونی ڕەوشتی. عەقڵ بەخششێکە لە خوای گەورەوە بەهۆیەوە دەگەینە هەقیقەتی شتەکان، بەڵام شتێکی ناعەقڵانییە بڵێین عەقڵ بە تەنها خۆی لە توانایدایە مانا و ئازادیمان پێبدات، کەوابوو مرۆڤ پێویستی بە ڕێنمایی ڕۆحی هەیە کە بە هۆیەوە عەقڵ دەبێتە ڕووناککەرەوە، دڵیش بەو پێیە کە ویژدانی قووڵمانە و زامنی ئەو عەقڵگەراییە ڕاپەڕێنەرەیە کە لە مامەڵەکردنی ڕۆژانەماندا بەکاری دەهێنین، ناکەوێتە سەرەوەی جۆرەکانی بەڵگەگەیەنەری و بیرکردنەوەکانی تر. ئەو عەقڵەش کە باوەڕ تێر خۆراکی دەکات، بەرچاوڕوونییەکی قووڵ لە واقیعی شتەکان بەدەست دەهێنێ، چونکە باوەڕ لە توانایدایە سنووری دیارییکات و شوێنی گونجاو بە خۆی لە بازنەی بووندا بۆ بدۆزێتەوە. ئەو باوەڕەش کە بە هۆی عەقڵەوە دەردەکەوێ و لە ڕێگای زمانەوە دەگەیەنرێ، لە توانایدایە ئەو یەقین و دڵنیاییە بهێنێ کە قورئانی پیرۆز بە زەرووری دەژمێرێ بۆ سەلامەتی زەین و ڕۆحمان (سورة الانعام:٧٥، التكاثر:٥–٧).

گێڕانەوەی میتۆدی بیرکردنەوەی قورئانی و مانای کلاسیکی بۆ عەقڵ ئەرکێکی پێویستە بۆ ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی، ئەرکێکە درێژ دەبێتەوە بۆ گۆڕەپان و بوارە جۆراوجۆرەکان وەك شەریعەت و یاسا و فێرکردن و هونەر و زانستە سیاسییەکان، بە دڵنیاییەوە کە تەرخان نەکراوە تەنها لەسەر بەرژەوەندی وڵاتە ئیسلامییەکان و خواستەکانیان.

ئەو داخورانەی کە لە سیستەمی مۆدێرنەی ئەمدواییانەدا تووشی پرەنسیپی عەقڵ هات لەسەر ئاستی جیهان زیانی گەیاند بە ئاوات و خواستە مرۆییەکان بۆ دامەزراندن و

بەرپاکردنی جیهانێك کە پشت بە عەقڵ و دادوەریی و یەکسانیی ببەستێت. ئەو بۆشاییەی کە لە بەرئەنجامی شکستخواردنی عەقڵی ڕۆشنگەریی هاتەڕوو، بە هێزە نوێیەکانی سەرمایەداری زیادەڕەو و کلتووریی نەبوویی و خۆپەرستی و هەڵەشەیی ڕێبازی زانستی پڕیان کردەوە.

جا بەو پێیە کە بەرهەم و قازانج و توانایی بڕگە و پێگەی سەرەکین لە سیستمی نوێی جیهانیدا، ئەوا ئێستا مانای ژیانی مرۆڤ لەسەر هەردوو ئاستی تاکی و کۆمەڵی پێناسە دەکات کە لە چ ژیانێکی عەقڵانیدا بژی. سیستمی هەنووکەیی جیهانیش جۆرەها پێناسەی نوێ بۆ عەقڵگەرایی و عەقڵگیری دادەهێنێ، ئەویش لە ڕێگای سیستمێکی ئاڵۆزەوە کە زۆر پەیوەستە بە گوتاری گشتی و فێرکردنی گشتگیر و داهێنانی تەکنیکی و پەیوەندیی خێرا و شەو و ڕۆژ داهێنان بۆ ئەو جیهانە گریمانەییانە کە ناژمێردرێن، هەموو ئەمانەش دەری دەخەن کە گەڕانمان بە دوای مانادا کۆتایی پێهات و ئێمەش کە مرۆڤانێکی عاقڵ و ئازادین، ئەوا ئێمەش گوایا دواجار جیهانێکی مرۆیی پوختمان بۆخۆمان دروستکردووە. جیهانێکی خاڵی لە بیروباوەڕەکان کە هیچ پاساوێکی بوونیان نییە و کۆمەڵە گومانێکی فیزاوی و لووتبەرزن.

لە رووی فەلسەفیشەوە، ئەو دژەخۆییە (تناقض) کە ریشکی لە رەوتی عەقڵگەراییدا داکوتاوە، لەوەدایە کە بناغەی بوونیی تایبەت بە خۆی دەتاشێ و پاشتر دێت بۆ پاساوی چەمکی مەرجەعیەتی خودی بە شێوازێك لە شێوازەکان عەقڵی مرۆیی کۆپی واقیع دەکاتەوە. بەڵام واقیع و عەقڵیش لە ڕووی عەقڵییەوە ڕێگا بە بناغەی خودی نادەن، چونکە عەقڵ بە سروشت و بە ئەرکی خۆی وەهایە کە بەپێی کۆمەڵە مەرج و ئامرازێك کە لە یەك کاتدا لە ناوخۆیو لە دەرەوەیدایە، کاردەکات. بەو پێیەش کە عەقڵ بنەمای (پێکەوە بەستن) و (کۆکردنەوە) و (پاراستن)ە، ئەوا هەمیشە دەگاتە ئەو جێگایە کە خودی خۆی تێدەپەڕێنێ و دەمانبەستێتەوە بە واقیعێکی گەورەتری بوون و زمانی مرۆیی. لێرەوە رەوتی عەقڵگەرایی رووت لە وێستگەی توندڕەوی باوەڕ بە من و بە خود کۆتایی دێت و سەرئەنجام دژ و پێچەوانەیە لەگەڵ عەقڵدا.

بەو پێوەرەش کە عەقڵ پرەنسیپێکە و بناغەی خودی هەیە، ئەوا لە توانایدا نییە بمانگوێزێتەوە بۆ دەرەوەی باری مرۆیی هەنووکەیی، بەڵکو تەنها ئەوەی لێدێ هەستێ بە بەهێزکردنی هەڵە میتافیزیکییەکانی و سەرلەنوێ کۆپییان بکاتەوە، هەروەها ئەو مرۆڤایەتییەی بانگەشەی بۆ دەکات مرۆڤایەتییەکی داخراوی زۆر قووڵە بەسەر خۆیدا، کەچی بانگەشەی رابەرایەتی بەسەر جیهاندا دەکات لە کاتێکدا کە ئەرکی رەوشتی ئەو بانگەشەیەی خۆی هەڵناگرێ، بە راستی هاتووە جیهانێکی داتاشیوە کە پرەنسیپی عەقڵ و هۆشیاری کەسێتی کردووەتە رەها تیایدا و نامۆییەکی قووڵ لە نێوان کەسێتی مرۆیی و کارەکەیدا ریشکی داکوتاوە. هەرکاتێکیش (بۆ هەموو ئەوەی بە دەورماندایە) هەموو شتێکمان دابڕی بەسەر سوودمەندیدا و نرخی ئەو سوودمەندییەمان بە گەورە سەیرکرد و گەورەمان کرد، ئەوا هەلی پارێزگاریکردن لە مانای دروشمەکان ون دەکەین کە سیستمی جۆراوجۆر بۆ واقیع پێکەوە دەبەستێت و خۆیشمان دەپارێزێ لە کەوتنە نێو هەڵەوە.

کەواتە لێرەدا بە مەبەستی گێڕانەوەی مانای کەسێتی مرۆیی بەو پێناسەیە کە گیاندارێکی گۆکارە، پێویست بە چەمکێکی نوێی عەقڵ دەکات، واتە: ئەو مرۆڤە کە دەبینێ، دەبیستێ، گوێدەگرێ، رووبەڕوودەبێتەوە، وەڵامدەداتەوە، هەڵدەچێ، بیردەکاتەوە، بەشداردەبێ لە چالاکییەکانی تری زیرەکی و ئیرادەی مرۆیی، هەروەها هەرگیز واقیعی گەورەتر کە خۆی بەشێکە لەو واقیعە، لە بەرچاوی ون نابێت. ئەو گێڕانەوەیەش لە توانادایە، بەڵام دەخوازێ تەواوی چەمك و بەها سەرەکییەکان کە لە ئەمرۆدا لەسەریان دەڕۆین سەرلەنوێ هەڵبسەنگێنرێن. عەقڵیش بەو سیفەتە کە پێکەوەبەستنێك و کۆکەرەوە و گەیەنەر و پارێزەرێکە سەرلەنوێ هەڵناسێتەوە و دەوری خۆی نابینێ هەتا ئەوە نەیەتەوە یادمان کە عەقڵ پەیوەندییە بە کەسی مرۆیی، یان بەرژەوەندیی کەسێتییەوە، یان تەنانەت بە بەڵگەهێنەرەکانیەوە، بەڵکو پەیوەندە بە هەموو بوون و بوونەوەرەکان و ماناکان و پەیوەندی و

پەیوەستەکانیەوە. هەروەها پەیوەندە بەو ڕێگایانەوە کە بە هۆیانەوە دەچین بەدەم بانگەوازی واقیعەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: (قُلْ فَلِلّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ) (الأنعام: ١٤٩). واتە: پێیان بڵێ: (کەواتە تەنیا خودایە، بەڵگەی روون و پڕبەپڕ و تێروتەسەلی لەلایە).

# ناوەڕۆك

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێـژەرەوەکانی زانکـۆ و بنکـەکانی توێژینـەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکـر و مەعریفە.

هــەروەها پــەیمانگا چــەند نووســینگە و لقێکــی لــە پایتــەختی وڵاتــە عــەرەبی و ئیــسلامییەکان و وڵاتــانی تــریش هەیــە، کــە لــە ڕێگەیانــەوە کــار و چــالاکییە جۆراوجۆرەکــانی خــۆی ئــەنجام دەدات، هــەروەها چــەند ڕێکەوتننامەیــەکی لەگــەڵ ژمارەیــەك زانکـۆی عــەرەبی و ئیـسلامیی و خۆرئـاوایی لــە سەرانــسەری جیهانـدا بـۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری

سـەنتەرێکی کوردسـتانی نـاحکومی ناسیاسـییە، گرنگیـی دەدات بـە توێژینـەوە و تـاوتوێکردنی پرسـە هزرییـە بنەڕەتییـەکان بـۆ دووبـارە هێنانـەگۆی دەق و تێکـستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخـەکانی ئیـسلام لـە بـوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنـچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان سوننەت و دەستەبەری لێکدانـەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بـۆ کـارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بـەرز و بـەڕێز بـە بـەکارهێنانی ئـامرازی زانـستە ئیـسلامییەکان و زانـستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

ـ بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەنـدە زانکـۆیی و پەروەردەییەکانـدا، بـە پـشتبەستن بـە بـەهرە و توانـا خودییـەکانی ئـەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

ـ کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

ـ پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

- بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

ـ خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

ـ هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.